# کەمانچەژەن

وەرگێڕانی لە ئەڵمانییەوە بۆ تورکی: تۆفیق کەرکووکیی میرئالای
وەرگێڕانی لە تورکییەوە بۆ کوردی: تۆفیقی پیرەمێرد
ئامادەکردنەوەی بۆ چاپ و پەراوێزلێدانی: ئەحمەد تاقانە



# کەمانچەژەن

وەرگێڕانی لە ئەڵمانییەوە بۆ تورکی:

**تۆفیق کەرکووکیی میرئاڵای**

وەرگێڕانی لە تورکییەوە بۆ کوردی:

**تۆفیقی پیرەمێرد**

ئامادەکردنەوەی بۆ چاپ و پەراوێزلێدانی:

**ئەحمەد تاقانە**



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

هەولێر    هەرێمی کوردستانی عیراق

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
شەقامی گوڵان - هەولێر
هەرێمی کوردستانی عێراق
هەگبەی ئەلیکترۆنی aras@araspress.com
وارگەی ئینتەرنێت www.araspublishers.com
تەلەفۆن: 35 49 224 66 (0) 00964
دەزگای ئاراس لە ٢٨ تشرین (٢) ١٩٩٨ هاتووەتە دامەزران

کەمانچەژەن

وەرگێرانی لە ئەڵمانییەوە بۆ تورکی: تۆفیق کەرکووکی-ی میرئالای
وەرگێرانی لە تورکییەوە بۆ کوردی: تۆفیقی پیرەمێرد
ئامادەکردنەوەی بۆ چاپ و پەراوێزلێدانی: ئەحمەد تاقانە
کتێبی ئاراس ژمارە: ١٢٣٦
چاپی یەکەم ٢٠١٢
تیراژ: ٦٠٠ دانە
چاپخانەی ئاراس - هەولێر
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ٣٥٥ - ٢٠١٢
ئەخشاندنی ناوەوە و ڕازاندنەوەی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
ڕێنووسی یەکگرتوو: بەدران ئەحمەد حەبیب

ژێنک:
ژمارەی پێوانەییی ناودەوڵەتیی کتێب
ISBN: 978-9966-487-33-1

## سەرەتای وەرگێڕی کوردی

پیرەمێرد

هێشتا لە ئەستەمووڵ بووم ڕۆژێ ئەو منداڵانەی ڕۆژنامە ئەفرۆشن بە هەموو کۆڵاناندا ڕایان ئەکرد و ئەیانقیژاند: "چیقدی چیقدی چالغیچی"[1]، فۆرمەیەک کە هەشت لاپەڕەیە لە ڕۆمانی سەرگوزەشتەی چاڵغیچی، کە ئێمە تارژمنی پێ ئەڵێین دەرچووە ئەیفرۆشن. یەکێکم کڕی، شەو خوێندمەوە زۆر خۆش بوو، ئینجا دانیشتین بە کۆمەڵ خوێندمانەوە ئەمەندە خۆش بوو لە دڵمانا بوو بە گرێ، ئاخۆ سبەینێ فۆرمەی تری دەردەچێ؟ بەیانی فۆرمەیەکی تری دەرچوو کڕیمان، شەو هەموو کۆ ئەبووینەوە یەکێک ئەیخوێندەوە ئەمەندە پێی پێ کەنین مەپرسە.. ئەم کتێبەم لە بیر مابوو تا پێرار یادی بەخێر (عەلی دایی)[2]ی کاتبی خەزینە بوو، لیستەی کتێبی فرۆشتەنیی کەرکووکی پێ نیشان دام (چاڵغیچی)ی تیا بوو زۆرم لا خۆش بوو کڕیم، شەوی زستان بەکوردی ئەمانخوێندەوە، منداڵ و مەزن بە چەشنێ دڵیان دایێ لێی تێر نەدەبوون، ناحەقیان نەبوو، ڕۆمانەکە زۆر خۆشە، لە ئەوروپادا تەنها (پۆڵ دەقووق)[3] مەشهوورە بە حیکایەتی گاڵتە و گەپ و لەناو تورکیشدا (حوسێن ڕەحمی)[4] لەم چەشنە هەزەلییاتەدا لە پۆڵ دەقووقی تێ پەڕاندووە. بەڵام ئەم ڕۆمانە لە هەموو ئاساری[5] ئەوان خۆشتر و بە قیمەتترە، هیچی پەردە بیروونانەی[6] تیا نییە، سەراپا پێکەنینێکی لەسەرخۆ و بە ئادابە.

ئەمە هونەرمەندێکی ئەڵمان نووسیویە، تۆفیق بەگی میرالا، کە مەشهوورە بە "تۆفیق بەگی کەرکووکی"[7] و ئەویش کوردە، وەری گێڕاوەتە سەر تورکی،

بەڵام تورکییەکەی ئەم، لە شێوەی ئەڵمانییەکەی شیرینترە. چەندێکە ئەمویست منیش بیکەم بە کوردی، زاتەن ئەو تۆفیقەی کە کردوویە بە تورکی دیسان کوردە، تا ئەمساڵ بۆم نەدەکرا، هەتا چەندێک مستەفای خوشکەزام خەریکی بوو، بە خەریتەزانی، هەندێکیشی تەرجەمە کردووە، بەڵام ئەشکالی ئەشغال مەیدانی نەدا، ناچار وا خۆم دەستم پێ کرد، ئێمە دوو تۆفیق.. تۆفیقیش لە خوا.

## کەمانچەژەن

## "چاڵغیجی"

### ئالفرێد موللەر

### چیی بەسەر هاتووە ئەیگێڕێتەوە

لە ئییالەتی "باویرا" لە دێییێکی بچووک لەدایک بووم، باوکم جووتێ گای بوو، فەلاحەتیی پێوە دەکرد، داخی ئەوەم لە دڵایە، کە دایکی خۆم نەدیوە، بەسەر منەوە چووە. باوکم هیچ ناوی لای من نەدەهێنا، بەڵام وەک خەڵک و خوا بۆیان ئەگێڕامەوە، ژنە لادێییێکی باش بووە، باوکیشم لەوانە نییە خوو بداتە منداڵ، تەپاڵەی گاکانی لە منداڵ خۆشتر ئەوێ، ئەوەندەی ئەو منی نەدەویست منیش ئەوەندە لە شاخی گاکانی ئەو بێزار بووم. بە ڕۆژ لێی ئەگەڕام تا ئەو ئەچوو بۆ جووت، لەگەڵ دوور ئەکەوتەوە، لە خوار دێوە داربەڕوویێ بوو، ئەچووم لە سێبەری ئەو دارەدا ڕائەکشام. لە "گڵ" وەک سەرین جێیێکم بەرز کردبووەوە، سەرم ئەکردە سەر، یا لقی دارەکەم ئەژمارد یا ئەو مێشانەی کە پێمەوە ئەنیشتنەوە. ڕاهاتبووم، ئەمزانی لقی دارەکە چەندە، بەڵام حیسابی مێشم پێ ڕانەدەگیرا، تەرحم نەدەزانی[٨].

ئێواران ئەهاتمەوە، گاجووتەکانم بۆ باوکم ئاو ئەدا، خۆیشم سا، شلەساوەرێ، هەنجیرە وشکێ، قنچکە پاسدیرمەیێک، نانە ڕەقێک(!) هەرچیم دەست بکەوتایە ئەمخوارد، شوکری خوام بە ناچاری دەکرد و لێی دەنووستم.

هەندێ جار ئەچوومە کلێسا، ڕاهیبێکی زۆر چاکمان بوو، خوا کاری ڕاست بێنێ فێری خوێندن و نووسینی کردم، ژنەکەیشی کەمانی چاکی لێ

ئەدا، خستمیە سەر سەودای کەمانچەژەنی. خوایش وای بۆ کردووم لە هەموو هونەرێک کەمان چاک لێ ئەدەم، دەنگیشم خۆشە، خۆیشم لە خۆم نەگەییوم کە لەم سەنعەتە پەسندەدا ئەمەندە بە کارم، بەم ڕەنگە گەییمە ١٨ ساڵی هەروا بە بێکاری و بێکارەیی ڕامبوارد. ڕۆژێکیان باوکم لێم تووڕە بوو دەری کردم، سوێندی لێ خواردم جارێکی تر پێت نایە بە ماڵما، زانیم بەڕاستییە، توورەکەیێکی پینەکراومان بوو، باوکم تووی تیا دەبردە سەرجووت، ئەوەم پڕ کرد لە نانەڕەقەی کۆن و هەندێ هەنجیرەوشکە و لەتکە هەرمێ و قنچکە پاسدیرمە، کەمانەکەیشم کە پووڵە پووڵە لە باوکم دزیبوو ئەو کەمانەم پێ کڕی بوو. ئەمانەم هەموو لە خۆم بار کرد یا ئەڵڵا و یا ڕووحوڵڵا لە ماڵ هاتمە دەرێ ئاوڕم نەدایەوە، قوڵپی گریانم دەهات، جا، ڕوو بکەمە کوێ؟ تا ئەم عومرە، لە حودوودی ماڵان بەولاوە هیچ کوێیە و هیچ ڕێیێکم نەدیبوو و نەناسیبوو. چوومە سەرشەقامی گەورە، ڕۆییم.. جا نازانم چەند ڕۆییوم، دیتم، خاو و شلک بووم، هێزم تیا نەما. بەردێکی گەورە لە کەنار ڕێدا بوو، چوومە سەر بەردەکە دانیشتم، هەندێ نانە ڕەقم دەرهێنا زگی خۆم تێر کرد و دەستم کرد بە کەمانە لێدان، ئاهەنگێکی ئیتالیانیی خۆشم گرتبووە پێش، ئەوەم لێ ئەدا، سا نازانم چەندم ڕابواردووە، لە پڕ دەنگی ئارابانە هات، گەیشتنە ڕاستی من، وا دەردەکەوت لە دوور گوێیان لە دەنگی من و کەمانەکەم بووە، لە بەردەمما ڕاوەستان.

منیش نەجیبانە وەک پرنسیک[٩] بە شەوکەتێکەوە[١٠] هەستام تەماشام کرد ئارابانەیێکی لاندووی[١١] زۆر گەورە، کە جێی هەشت کەسی تیا ئەبێتەوە، چوار بارگیری تێ بەستراوە، لە پێشەوە ئاراباجییێکی پۆشتە و لە دواوە دوو ئافرەتی نازدار، یەکێکیان زۆر جوان و تازەکچ و ئەویتر ئافرەتێکی قەیرە، ئافرەتەکە کەڵەگەت و بەخۆوە، ڕەنگێکی سوور و سپی، پرچ زەردی چاو شین. تازە کچەکەش یەک دەفعە وام هاتە پێش چاو کە موتڵەقا[١٢] ئەمە پەریی ئاسمانە، ئەمەندە جوان بوو، نەمپەرژا تەماشای سیمای بکەم، کە

ئەمە ڕەنگی چییە و چاوی چۆنە و برۆی چۆنە و دەمی چۆنە؟ هەر ئەوەندە بە شوعلەیێکی نوورم زانی.

زاتەن من تا ئەو دەمە نەمزانیبوو ئافرەت چییە؟ وام ئەزانی وەک مانگا ژنەکانی دێی ئێمە بۆ گەورەمالین[12] و نان بە تەپالە کردن و منداڵ بەخێوکردن و دەغڵ هاڕین ماکینەیێکن لە ئێسک و پێست دروست کراون. چووزانم تووشی هی وا دەبم بە جارێ جنسی لەتیفم پێ دەناسێ.

من هەروا، واقم وڕ ما (ترپیر) لە پەنجەرەی ئارابەکەوە سەری کێشا و هەندێ جریوەی لێوە هات لە زبانەکەی نەگەیشتم، پێ کەنی، منیش تووڕە بووم هاتم بڕۆم، کەچی کچەکە بە شێوەیێکی شیرینی ئەڵمانی لێی پرسیم:

– ئەفەندی بۆچ تۆ ئەڵمانی؟

– بەڵێ خانمەکە (لێرەدا لە لەهجەی فرانسزیدا مادام هەیە کە بە ژن ئەڵێن، ئێمە یایە بڵێین، مادموازێل هەیە کە مەخسووسی کچانە، ئێمە بڵێین خانمەکە).

– ئەفەندی گوێمان لە دەنگی کەمانەکەت بوو، زۆر خۆشت لێ ئەدا، ئێستا بۆ کوێ ئۆغر ئەکەی؟

– ئەگەر ڕاستت عەرز بکەم خۆیشم نازانم.

– چۆن؟ بە ڕێدا ئەڕۆی نازانی بۆ چە جێیێک دەچی؟

– ئەیشڕۆم و نایشزانم ڕووم لە کوێیە.

– کەوا بێ فەرموو لەگەڵ ئێمە وەرە، کە هیچ نەزانی بۆ کوێ دەچی.

– منیش بۆ ئەمە قسمەت لەم سەر ڕێیەی دانام، لە خزمەتدام، سواربم؟

– بەڵێ سوار بە.

لە پشت ئەرابەکەوە جێی خدمەتکار بوو، خۆم هەڵدا و سوار بووم. ئەرابەچی قامچیی لێ ڕاکێشا، وڵاغ کردیانە چوارناڵە، ئەوەندەی نەمابوو شەبقەکەم با بیبا، لە خۆشییانا باکم نەبوو دوو سەعاتی مابوو بۆ ئێوارە

چۆن بچمە سلاوی؟[14] زۆریشم پێ گران بوو، هەروا لێی خوڕی تا ڕۆژ ئاوا بوو، ئەو جێگای دوای ئەرابەکە، کە بۆ خدمەتکار کرابوو جێی سە[15] کەسی بە فەڕاحی لێ ئەبووەوە، لێی ڕاکشام، توورەکەی نانەکەم نایە ژێر سەرم. جار جار لە دێ، (وەچە) توتونم[16] ئەچنییەوە و سبیلێکم (پیپـۆ) پەیدا کردبوو، بیرم کەوتەوە دەستم لە باخەڵم کوتا، سبیلەکەی تیا بوو، وتم با سبیلێکی لێ بکێشم، توتونم پێ نەمابوو، جا، ئینجا چی بکەم خۆ ئەم عەرەبەچییە توورەیە هێندە نەگریسە ئاورێکی لێ نەدامەوە و خۆشی و چلۆنییەکی لە گەڵ نەکردم کەوتوویشەتە کڵێشەمەوە سبیلێکی لێ بادەم لە دڵی خۆما وتم سواڵی توتون عەیب نییە.

– هۆ ئەرابەچی، توتونت لا نییە.

خوستی[17] لە خۆی بڕی نقەی نەکرد، وام زانی کەڕە، گوێی گرانە، لەتکە سێوێکم تێ گرت کەوت لە سەری، ئاوڕی دایەوە، بە دەنگێکی گڕ و لووتێکی منگنەوە بۆڵەیێکی کرد، وتی:

– کابرا چیت لێ بەر ئەبێتەوە، وەخت بوو شەبقەکەم بخەی؟

وتم:

– توتون.

وتی:

– توتون چی لێ دەکەی؟

وتم:

– ماشاڵڵا لە عەقڵ و کەماڵت، نازانی توتون بۆ چییە؟

جوابێکی ناشیرینی دامەوە.

وتم:

– دیارە زۆر نەفامی.

– له تۆیش نەفامتر؟

ئێمە گەیاندمانە ئەم تێکەڵییە، خانمەکەم تێی خوڕی:

– (مۆرینۆ) بێدەنگ بە، ئەرابانەکە ڕاگرە،

بە منی گوت:

– ئەفەندی فەرموو دابەزە،

خۆم فڕێ دایە خوارەوە، دەرگای ئەرابەکەی کردەوە وتی:

– وەرە ژووری،

لەو کەیفەدا کە چوومە ژووری لە تەنیشت خانمەکەمەوە دانیشتم بە مەعناوە (ئەحا)یەکم لە کابرای ئەرابەچی کرد، هەنگڵ هەنگڵ[18] ئاوسا، بە کەماڵی شەتارمتەوە[19] شەبقەم داگرت و ڕووم کردە ئافرەتەکان، وتم:

–(ئێوارەتان بەخێر) قاە قاە پێکەنین.

ناویان پرسیم، فەرمووم:

– (ئەلفرێد مۆللەر ئەفەندی).

– خانمەکەم وتی ئۆخ چەند ناوێکی خۆشە.

– بەڵێ خۆیشم ئەیزانم ناوێکی زۆر خۆشە.

– تۆ موتریبی؟

– خێر، هەروا بۆ کەیفی خۆم کەمان لێ ئەدەم.

– هیچ سەنعەتێکی تر نازانی؟

– خێر. بەڵام وەک ئێوە ناوونیشانی من ئەپرسن، کە من لە دێدا هەموو کەس ئەمناسێ. ئەگەر منیش لە ئێوە بپرسم کە نەناسراون، عەیبە یان نە؟

تەرپیر، دیسان پێ کەنی، بەڵام خانمەکەم فەرمووی:

– خێر عەیب نییە. ئەو مادام (سارینا ریپۆتۆ)، منیش (میکائێللا قورتساس).

– چۆن؟ هەر وا ئەم ناوە رووتانە و هیچی تر؟ من راهیب پێی وتبووم: لە ئەورووپا عائیلەیێک کە نەختێ ناسراوبێ لە پێش ناوەکەیەوە یا (دو) یاخود (فۆن) بە لەقەب[20] ناو ئەبرێن یا حەزرەت، یا جەناب، یا ئاغای فلان، ئەبوایە مادام کە سواری ئەرابە بوون و ئەرابەچیی وا بە دەعیە و توورەتان هەیە لەقەبێکتان ببوایە. خۆیشتان نەتانبوایە بتانخواستایە تا لەم رێویانە هەموو کەس شەرمی لێ بکردنایە.

خانمەکەم زەردەخەنەیێکی ناخواهی[21] کرد و وتی:

– جەنابی ئەفەندی رجاییکم هەیە، ئێمە وا بووین بە هاورێی یەک، وا ئەوەندە ناو و نیشانی خۆمان هەڵدا لەوە زیاتر جارێ مەپرسە تا خۆمان پێت ئەڵێین، دوایی یەکتر ئەناسین.

راستی لەمە، کە نیوە هەڵکالانێ بوو[22]، منیش کەمێ توورە بووم، خۆ هێجگار ئەم هەموو تێکەڵییەمان بە بەینا رابورد، ئەوەندە ئەم جووتە ئیکرام[23] نازانن کیسە توتونەکەیان بخەنە بەردەمی من و بڵێن فەرموو سبیلێ تێکە.

هاتم بە کوردی داوای توتونیان لێ بکەم، دوایی وتم با بە نەزاکەت[24] بێ خۆشترە، سبیلەکەم هێنایە دەمێ وەک بلوێری منداڵان کە لە قوڕی سپی دروست ئەکرێ و فووی پیا دەکەن وەک دووزەلە دەنگی دێ، فیکەم پیاکرد، (تەرپیر) وتی:

– حەو.. بلوێرژەنییش ئەزانی؟

ئینجا تەواو خەست بوو، بە توورەییەوە وتم:

– خێر بلوێژەن نیم، بەڵام سبیلەکەم توتونی تیا نییە، داوام لە ئەرابەچییەکەتان کرد نەیدا وا بە ئیشارەت، سبیلەکەم خۆی داوای توتون ئەکات، ئێوەیش گوێی نادەنێ. چی بکا بێ توتونییە.

سارینا دیسان تا تیا بوو بە دەنگێکی بەرز دایە قاقای پێکەنین.

خانمەکەم وتی:

-تۆ ئەزانی ئەوروپا (دو) و (فـۆن)یان هەیە؟ بۆچ نازانی ئافـرەت تـوتون ناکێشن؟

وتم:

– حەو، ژنـانی ئێمـە لە پیـاو زیاتر تـوتون ئەکێـشن، هەمـوو جـارێ گلکی سبیلەکەیـان ئەخـەنە گوێچکە منداڵ و لە سـەرەوە فـووی پیا دەکەن گوێی قانگ ئەدەن، ڕەنگە پوورە سارینا بیزانێ.

هاتبوومە ئەمە دابەزم سەری خۆم هەڵگرم. خانمەکە وتی:

– ڕاوەستە بزانم لە چی وا سخڵەتت گەیوەتێ؟

– ئەووەڵەن لە ئەرابەچییەکەتان – کە زۆر چوړووکە[٢٥] – سبیلی توتونی لە پێش چاوە، دووەم لە پێکەنینی تەڕپیر. سێیەم ئەوا فەرزمـان کرد خۆتان توتون ناکێشن، ئەی نەدەبوو بۆ میوان توتون لەگەڵ خۆتان بێنن؟

لێرەدا دیسان تەڕپیر هەڵی دایە وتی:

– ئێمە چووزانین لە ڕێ بە خزمەت تریاکیێکی وەک تۆ دەگەین.

بەم هەڵتێقـوتانە وازی نەهێنا دیسـانەوە پێکەنینە نـاموبارەکەکەی دەست پێ کرد و بە زۆر خانمەکەیشم هاتە پێکەنین.

خـوایە، بە قـوربانت بم بـە پێکەنینی مـیـقـائیلایش دەڵێن پێکەنین و بە شیرەشیرِی تەڕپیریش ئەڵێن پێکەنین. چاریشم نییە، ئەوا وتمان لە ئێرانە هاتمە خوارێ، بەم شەوە تاریکە ڕوو ئەکەمە کوێ؟ لەم دارستان و جەنگەڵ و بیابانەدا چی ئەکەم، هەر دڕندە ئەمخوا. لە دڵی خۆمدا قەرارم دا، کە ئەوان پێ کەنین هیچ سخڵەت نەبم منیش (هی هی) وەک جوانووە ئەسپ بحیلێنم، هەروا لەبەر خـۆمــەوە لێکم ئەدایەوە مــاتی دای گـرتبـووم خــانمەکـەم لێی پرسیم:

– ئەوە چی لێک ئەدەیتەوە مۆللەر ئەفەندی؟ نیوەی هەزار پێنجسەدە.

- چی لێک بدەمەوە؟ بێ توتونییە.

- باشە توتونت لە مۆرینۆ بۆ ئەسێنم، بەڵام نابێ لای ئێمە سبیل بکێشی، هەڵسە بچۆرە لای ئەرابەچییەکە. پێی ئەڵێم توتونت باتێ.

ئەمەم زۆر پێ ناخۆش بوو، من گاڵتەم بە ئەرابەچی کردووە و ئێستا بچم لەلای دانیشم سەرێ توتونم بداتێ، ڕووم کردە میقائێللا وتم:

- خانمەکەم من لێرە ئێوە نارەحەت ناکەم، سبیلەکەم تێ کرد سەرم لە پەنجەرەکەوە دەبەمە دەرێ، دووکەڵەکەی دەدەم بەبا.

دیسان تەرپیر هەڵی دایە وتی:

- ئەفەندی، میقائیللا کە ئەمەندەی تۆ خۆش ئەوێ، تۆ بۆچ ئەمەندە سخڵەتی ئەو ئەدەی؟

ئیتر نەیهێشتمە ڕەت، بانگی کرد:

- مۆرینۆ ڕاوەستە.

ئەرابەی ڕاگرت بە منی گوت:

- فەرموو لای مۆرینۆ هەتا ئەتوانی سبیل بکێشە، بەڵام ئاگاهدار بە لە پشتەوە دووکەڵمان بۆ نەیێت.

بێ دەسەڵاتییە و لە دابەزیندا ترسی گیان، ناچار چوومە لای ئەرابەچی بۆ سەرێ توتون ئەم پەتپەتییەم بە سەر هات، توتونم لێ بوو بە دانە گەنمەکەی حەزرەتی ئادەم، ئینجا وتم:

- ئەرابەچی من بۆ سبیل کێشان هاتمە لای تۆ مەپیندار[٢٦] دەرکرابم، ئەرابەچی کیسە توتونەکەی فڕێ دایە بەردەمم، وتی:

- نەخەڵەتابی لە سەرێ توتون زیاتر دەربێنی.

کە وای گوت ئینجا ئەوەم کەوتەوە خەیاڵەوە کە چنگێکی لێ بدزم، ئەگەر وای نەگوتایە ئەوەم بە خەیاڵا نەدەهات.

هەتا گرتی سبیلەکەم داگرت و چنگێکیشم لێ کردە باخەڵم و کیسەکەم بۆ فڕێ دایەوە.

تەماشـایشی نەکرد، کردیەوە بە قەدیا. ئەوا تـوتونم دەست کەوت و سبیلم تێ کرد، جا ئینجـا ئاگر لە کوێ پەیدا کەم؟ ئێستا بەم هەزار حاڵە توتونم لە ئەرابەچی سەندووە داوای ئاگریشی لێ بکەم دێ بە گژما. چی بکەین چاکە؟ وتم با داوا لە سارینا بکەم، ئەگەر خۆیشی نەیبێ ئەو بە ئەرابەچییەکە بڵێ ئاگرم ئەداتێ، وەرگەڕامەوە بانگم کرد:

– جەنابی عیفـفەت و نەزاکـەت مەئاب[27] ساریـنا خـانم، لە سـایەی تۆوە توتونم دەست کەوت، بەڵام ئاگر دەست ناکەوێ.

لەم ئەلقاب[28] و فـەسـاحـەتەی[29] من ئەمـجارە بە خـۆشی خـۆشـیـیـەوە پێ کەنی بەڵام خانمەکە بە قاقاوە وتی:

– لەم ئیحتیراماتەیشی ئێمەی تیا نییە.

وتم:

– تۆ بەبێ ئـەلقـاب جـوانی، زادەگـانی بێ ئەلقـاب و جـوانـی بێ ئارایش و توالێت.

سارینا تووڕە بوو وتی:

– کـەوابێ من ناشـیـرینم، تۆیش گـۆڕت بێ سـبـیـلەکـەت ڕاگـرە بـەیانی ئەگەیتە دێیێک لەوێ ئاگری بخەرە سەر.

میکائیللا بانگی کرد:

–ئوستە مۆرینۆ ئاگر بدە بە بەگ.

هاها.. بە مـەدحـێک بوویشـین بە بەگ، ئەرابەچی خـودگـیـریی[30] نەکـرد، قـوتووی قـاوی دامـێ، سـبـیلم داگـیرسـاند و لنگم دایە سـەر لنگ، باوکم لە کوێیە؟ سەیری ئەم عەزمەتەم بکا... نیو سەعاتی سبیل دەوامی کرد، ئینجا فـتم کـرد[31] و هـەر چاوەڕێ بـووم بانگم کـەنەوە ئـەودیو، دەنگ نەبوو، ئینجـا

توورەکــەم نایە ژێر ســەرم و بۆی کــەوتمە کنگەخــەو،[32] ســا نازانم چەند نوســتووم، لە پڕێکا ئەرابە بە جارێ هەڵبەزییەوە، وام زانی لەت و پەت بووە، کە خەبەرم بووەوە تێفکریم ئەرابەچی نووستووە، میکائیللا بانگی کردووە بۆی خەبەر نەبووەتەوە، ئینجا من بانگم کرد دیسان هەڵنەستا، میکائیللا گوێی لە دەنگم بوو بانگی کرد:

– ئەلفرێد ئەفەندی توخوا ئەو مـاندووە هـەڵی مـەسـتـێنە خـۆت بزانە ئەرابەکە ڕەوڕەوەکەی[33] نەشکاوە؟

بازم دایە خـوارێ تێ فکریم، ئەرابە هیـچی لێ نەهاتووە بەڵام وڵاخـەکـان وەستاون، منیش بە فرسەتم زانی قاچێکی مۆرینۆم گرت و ڕام کێشا لەپڕ خەبەری بووەوە زۆر تووڕە بوو وتی:

– بۆچ من سەگم لاقم ڕادەکێشی؟

ئەو تووڕە بوو، من تووڕە بووم، لەو دیوەوە میکائیللا بانگی کرد:

– موسیۆ مۆللەر سەرکەوەرەوە جێی خۆت.

منیش وتم:

– باشە، بەڵام خۆ من لە سبیل کێشان بوومەوە.

گوێی نەدا، وتی:

– جارێ بچۆرە شوێن خۆت.

چارم نەما، کلکم بە خۆما گرت و سەرکەوتمەوە لای ئەرابەچی، سا نازانم چەند سەعاتی تر ڕۆیوین، هەموومـان بە جارێ خەومـان لێ کەوتبوو. من کە چاوم کردەوە ڕوانیم وڵاخەکان وەستاون، لە شوێنێکداین دارستان و شاخ سێبەری درەخت دنیای تاریک کردووە، شەوقی فەناری[34] ئەرابەکە بەردەمی وڵاخەکانیش نابینێ، پیرەژنان حیکایەتیان بۆ کردبووم کە لە جەنگەڵی وادا دێو و پەری و جنۆکــە و دڕندە هەیە، ســامم لێ نیــشــت و لە پێش چاوم تەریدە[35] و دێو ئەڕۆین وەکوو گـوێم لـە دەنگی پێی زەلام بێ وا بوو، هێـز لە

ئەژنۆما نەما، لە پڕێکا گرمەیێک وەک پژمەی جانەوەرێک پەیدا بوو، من کەوتبوومە خوارێ لە زرمەی من ئەرابەچییەکە خەبەری بوو بووەوە تێی خوڕیم:

-کوڕە کێی؟

هاوارم کرد:

-وەستا مۆرینۆ منم.

وتی:

-بۆچ کەوتووی؟

وتم پازدە هەنگاو لە بەردەممانا دەنگی پێی زەلامم بیست و پژمەی جانەوەرێک، ئەرابەچی قاە قاە پێ کەنی وتی:

– خوا حەقە پەهلەوانی چاکی و دلاوەری بە جەرگی، لە پژمەی ئەسپەشێ کەوتوویتە خوارێ.

لەم گفتوگۆی ئێمەیە میکائیلا خەبەری بوویووەوە بانگی کرد:

– ئەوە چییە؟

مۆرینۆ لە پێش مندا جەوابی دایەوە وتی:

– خانم ئەفەندی ماشائەڵلا موسیۆ مۆللەری پاڵەوان ئەمەندە ئازایە لە پژمەی بارگیر کەوتووەتە خوارێ.

ئەم پلارەی ئەراباچییە تەئسیری کردە جەرگم، بەڵام هێشتا ترسم بەسەر نەچوو بوو لە دڵی خۆما وتم ئێ با بگەینە شاتۆ و ترسم نەمێنێ خۆم ئەیزانم چیت پێ دەکەم. میقائیلا وتی:

– ڕەنگە لە خەودا ترسابێ قەید ناکا.

من وتم:

– خانمەکە من لەوانە نیم بترسم مۆرینۆ درۆ ئەکا.

مـۆرینـۆ وا تێ بگەم درۆزنی پێ نـاخـۆش بوو قـامـچـیی بۆ وڵاخـەکـان داوەشـاند، ئەیویست تێم بگەیەنێ کە منیش وا ئەداتە بەر قـامـچـی، لەتاو قامچی، وڵاخ کەوتنە لۆقە[٣٦] و منیان بەجێ هێشت.

بانگم کرد:

– هەی لە ڕێی خوادا بەجێم مەیێڵن، عەرەبەچی وتی قەید ناکا[٣٧] نەختێ پێ هەڵگرە بۆ بەیانی ئەمانگەیێنێ.

ناچار ڕام کرد، خۆم گەیاندە پەنجەرەی میقائیلا، بانگم کرد:

– بەجێم دێڵن؟

سارینا وتی:

– بەخـوا بۆ بەجـێـهـێـشتن باشـی بەڵام ئەگـەر بـەجێ بمێنی من پـەکی پێکەنینم ئەکەوێ، بڕۆ سوار بە و عەرەبەچیی ڕاوەستاند.

ئینجا، کە ترسی بەجێ مانم نەما، خۆم کوتایە بەردەمی خانمەکەم وتم:

– تۆ دەربارەی من زۆر بە ڕەحمی، من کە کەوتوومە خوارەوە هەموو لەشم تێک شکاوە، توخوا ئیتر مەمنێرە لای ئەرابەچی.

فەرمووی:

– وەرە لامان سوار بە.

خۆم هاویشتە ئەرابەوە.

– سبیلمان لەلا ناکێشی؟

– ئیتر تۆبەم بێ حەز ئەکەی هێجگاری توتون ناکێشم.

– خێر، خۆ هەمیشە لە ڕێ و بان نابین، لە شـاتۆکەدا[٣٨] ئەتوانی سـبیل بکێشی.

– ئای بۆچ لە شاتۆ لێک جوێ دەبین.

دیسان سارینا هەڵی دایە وتی:

– خۆمان حازرکەین کە گەیشتینە "شاتۆ" میقائیللا لە پرنس ئەلفرید مارە دەکەین.

هەرچەند کە خەجاڵەتیش بووم ئەمما ئەمە گاڵتە بوو بۆیە مەداری هیوا و ئومێد ئیتر چەسپییە کەللەمەوە، میقائیللا بەرەکەت دا پێ کەنی، شەرمەکەم بەسەرچوو.

ئیتر بە ئەرابەچیی وت:

– مۆرینۆ نەختێ گورج لێ خورە زوو لەم ئۆرمانە[39] دەربچین.

قامچیی کێشا سا هەروا ڕۆیین تا ڕۆژ بووەوە، بە ڕاستی گزنگی هەتاو لەو دەم شاخەوە لە کەناری جەنگەڵستان و[40] ئۆرمان زۆر شاعیرانە بوو، هەندێکی تر ڕۆیین گەیشتینە شوێنێ، جۆگە ئاوێ هارەهارێ ئەڕوا ڕوو ئەکاتە دەشتی مێرغوزار[41] و لالەزار، لەوێ دابەزین. مۆرینۆ وڵاخەکانی کردەوە و ئاوی دان و ئالیکی کردن بەسەرەوە و خانمەکەم وتی:

– ئەفەندی برسیت نییە؟

وتم:

– ئارەزووی ئێوەیە.

لەسەر ئەو چیمەنە مۆرینۆ سفرەی ڕاخست، سفرەیێکی شاهانە.

بانگیان کردمە سەر سفرە، ڕام کرد چووم توورەکەی نانەڕەقەی خۆم هێنا دەرکم کردەوە بە جارێ هەڵم ڕشتە سەر شەکرلەمە و کوفتە و بریانییەکە، سارینا ئەو دەشتەی پڕ کرد لە قەهقەهە[42]، من زۆر تووڕە بووم وتم:

– من بە سواڵکەر ئەزانی.

خانمەکە فەرمووی:

– تووڕە مەبە سارینا حەز ئەکا لەم دارستانەدا قەهقەهە بەجێ بێڵێ.

لە نان بووینەوە، میقائیللا بە حوزنێکەوە[43] وتی:

– ئینجا ئەگەر لوتف[44] بفەرمووی ئێرە جێی کەمانە.

ڕام کرد کەمانەکەم هانی وتم:

– چی ئارەزوو ئەفەرمووی؟

وتی:

– ئەگەر بەستەی "هیجرانی"ی مەشهوور "لۆیـجی" بخوێنی زۆر مەمنوون ئەبم.

خواوڕاستان من خۆم زۆرم ئەو بەستەیە لا خۆش بوو و چاکیشم ئەزانی، عەینەن هیجرانیی کوردی، بەڵام گلەیی لە بێوەفاییی یار، بە هەموو حوزنی خۆمەوە کەمانەم هێنایە واوەیلا[45] و خۆیشم بەر و ڕوو ئەو بێشەیەم[46] زرنگاندەوە.

کاتێ ڕوانیم خانمەکەم ڕووی کردووە بەولاوە. دەستەسڕێکی ئاوریشمی بە دەستەوەیە چاوی ئەسڕێ، زۆر پەشیمان بوومەوە، وتم ئیتر ئەم مەقامەی بۆ ناڵێم.

قاوەڵتی و گۆرانیی ناو دارستان بڕایەوە و سواری ئەرابە بووین، ئینجا قەدرم زیادی کردبوو، حەتتا ئەرابەچی مۆرینۆیش بە خۆشەویستییەوە ئەیڕوانییە من.

ئینجا عەرەبە بەسەر شۆسەیێکی ڕێکوپێکدا هەرلەخۆیەوە وەک خل بێتەوە بێ خشە و خرپە ئەڕۆیی، منیش لەناو ئەرابەکەدا بەرابەر بە خانمەکەم دانیشتبووم، گا گا بە حورمەتێکەوە تەماشای چاویم ئەکرد بە لادێیی و هیچ نەزانیی خۆمەوە حوزن و کەدەرێکم لە چاویا ئەدی، لە بەختی خۆی نارەزا بوو، بە خوا ئەو چاوە گەشانە بەماتییەوە هێندە جوان بوو نیمنیگاهێکی[47] جەرگی ئینسانی دەبڕی، ئینسان لە شیرینیی ئەندامی زیاتر عاشقی شێوە و ئەتواری نازکی و کیباریی ئەبوو، خەیاڵم دابووە حاڵی

ئەو، منیش ماتی و ماتەمی گرتبوومی، خەو بردبوومییەوە کە خەبەر بوومەوە تاریک بوو شەو بە سەردا هاتبوو، خانمەکە فەرمووی:

– دیارە لە ئەرابەدا ماندوو بووی وا منت لە بیر چووەوە و تێر نووستی.

– زۆر شەرمەساری بۆ منە کە جێگایێ تەشریفی تۆی لێ بێ و من بنووم لە خەوەکەیشدا هەر لە خزمەت تۆدا بووم.

ئەمە خواوراستان هات زۆری لا خۆش بوو بە درێژیی نەخستمەوە، ئینجا لێم پرسی:

– قوربان زۆرمان ماوە بۆ شاتۆ؟

– بڕوانە لە پێشمانەوە ڕووناکیی چرا ئەبینی؟ ئەوە دێیێکە بە ناو ئەو دێیەدا تێ ئەپەڕین، نیو سەعات لەو دێیە بەولاوە ئەگەینە شاتۆکەی خۆمان.

من لە خۆشی خۆشیی ئەمەدا بووم کە ئیتر لە سەفەری ناو ئەرابانە دەردەچین و ئەگەینە مەنزڵ، کەچی تەرپیر وتی:

– ئەوە میقائیلێلا دڵخۆشیت ئەداتەوە، هێشتا زۆرمان ماوە. نەختێکی تر ئەگەینە سەر پردێکی گەورە، ئەو پردە نیوەی ڕێیە.

زۆری نەمابوو باوەڕی پێ بکەم، بەرەکەت دا خانمەکە فریام کەوت وتی باوەڕ مەکە، هێندەی پێ نەچوو بە دەنگی ڕەورەوەی ئەرابەکەدا زانیمان گەیشتووینە سەر پردەکە، سا تێ پەڕین و تێ نەپەڕین مۆرینۆ بە دەنگێکی مەردانەوە بانگی کردە پێش خۆی:

– کورە کێی؟

ئەرابە ڕاوەستا و ڕوانیم لە هەر دوو پەنجەرەی هەردوو دیوی ئەرابەکەوە دوو سەری زل سەریان کرد بە ناو ئەرابەکەدا، دوو کەڵلەی کوڵکنی جەهەننەمی، ناوچاوان گرژ، یەکێکیان دەستێکی هەڵبڕی و وتی:

مەجووڵێن.

که وای گوت ئەمەندە ترسم لێ نیشت ئەو شەوە کە لە پژمەی بارگیرەکە کەوتمە خوارێ لە چاو ترسی ئەمشەوەدا جەژن بوو، لەگەڵ ئەوەیشدا چونکە چاوم لە چاوی خانمەکە بوو هاتم وەک دلاوەر بێمە مەیدان، بانگم کرد:

– چیتان ئەوێ؟ وا سەرەڕێ بە ڕێبوار ئەگرن.

یەکێکیان وتی:

– تۆ کێی؟ پیسی مردار، ئەوەندە لە خۆتا شک ئەبەی بێیت بەگژ ئێمەدا؟

میقائیللا بە منی وت تۆ دەنگ مەکە، خۆی، مەردانە دەستێکی نایە کەلەکەی بەرز بووەوە ڕووی کردە کابرا وتی:

– بە من بڵێ چیت ئەوێ؟

کابرای جەردە بە ئەداییکی چوختییانە[48] و بێعارانە وتی:

– ئۆو، ئۆو، جەنابی خانمە بچکۆلە وا بە توندی نە، نەختێ بە هێواشی، ئێمە سێ کەسین هاتووینە سەر ڕێت، بەشی گوزەرانی دە پازدە ساڵمان بدەرێ داوێنت ماچ ئەکەین و ئەڕۆین بە ڕێی خۆمانا.

– ئەی ئەگەر نەبێ چی ئەقەومێ؟

– ئەوسا خۆت ئەیزانی ئۆباڵتان بە ئەستۆی خۆتان.

کە زانیم خانمەکە هاتە زبان و توند بۆوە، منیش لە دوای ئەوەوە وتم:

– ئاغا بۆچ خەڵک کرد و کۆشی بۆ ئەوە ئەکەن بیدەن بە ئێوە؟ وا پێت ئەڵێم، ئەڕۆی برۆ، ناڕۆی پەلت ئەگرم ئەتدەمە دەست زابیتە[49]، ناوەجاخ.

کابرا کە ئەمەی بیست دەمانچەکەی ئاراستەی ناوچاوانم کرد، ئەوی تریان کە لە پەنجەرەکەی ئەولاوە سەری هێنابووە ژوورەوە، زوانیم هیچی بەدەستەوە نییە، لەو دڵنیاییم پەیدا کرد کە هیچی پێ ناکرێ، هۆڵی ئەوەم بوو ئەمیان بەیدەست[50] بکەم، کوتوپڕ پەلاماری دەستی دەمانچەکەییم دا، پەلم گرت و بام دا دەمانچەی لە دەست کەوتە خوارێ ناو ئەرەبانەکە.

ڕەفیقەکەی لەو دیوەوە سەری تەواو هێنایە ژوورەوە دەمانچەکە هەڵگرێ، ڕوانیم ئەو میقائیللا نازک و نازدارە وەک بەچەشێرێ[51] هاتە جۆش، ملپێچە ئاوریشمەکەی لە ملی داگرت و ئالاندییە ملی کابرا و توندی کرد، لرخە لرخی پێ کەوت، سارینایش سەرێکی ملپێچەکەی گرتبوو توند ڕای دەکێشا.

لە پڕ زرمەی دەمانچەیێک هەستا و نیوە خنکاو بەلادا هات، نەمانزانی ئەمە کێ بوو؟ کە لە پەنجەرەکەوە تەماشامان کرد مۆرینۆی ئەرابەچی بوو لە سەر خۆ، هیچ نە شڵەژابوو بە هێواشی وتی:

– خانم ئەفەندی مەترسە هیچ نییە، ئیتر ئەندێشەمان نەما..

کە ئەو وای گوت، منیش وتم:

– ئای وەستا مۆرینۆ یەکێکی تریان وا لێرە بە تەڵەوە بووە، من پەلم باداوە، وتی:

– ئافەرین بۆ تۆ، تۆ ئەو کوڕە بوویت و ئێمە نەماننناسیبووی.

کە وای گوت (ئەحایێکی ترم کێشا و بە دەماخ قۆڵی کابرام وا بادا هاواری کرد، وتم:

– کافر خۆت ڕاوەشێنە و دەستت توند بقووچێنە، پارەکانی کە لە خانمەکەی منت وەرگرتووە لە دەست نەکەوێتە خوارێ.

– لەو وەلوەلە[52] و هەرایەیشدا دیسان "تەرپیر" دایە قاقای پێکەنین، ئەمما مۆرینۆ وتی مەیکوژە با ئەمەیان بە زیندوویەتی بیبەینە پۆلیسخانە بیخەینە تەڵەوە، مۆرینۆیش هات دەرگای ئەرابانەکەی کردەوە توند و تۆڵ مەیکە چنگیمان پێچا.

کە هۆشم هاتەوە و تەماشای دزەم کرد فیلەتەنێ بوو، ئینجا وورە گرتمی کە من چۆن وێراومە دەست بدەمە دەسی ئەو پەتیارەیە[53]، وەک جوولەکەکەی زرێبار ئەوسایە زۆری نەمابوو زەهرەترەک[54] بم.

لێم بووبوو بە مەراق ئایا کە ئەمانە هاتن دەوری ئێمەیان دا، مۆرینۆ لە کوێ بووە؟ مەگەر لە ڕێوە یەکێکیان چووە لە پێشدا مۆرینۆ بگرێ، مۆرینۆ بازی داوەتە خوارێ لەگەڵ کابرا تێک هەڵچوون.

فرسەتی لێ هێناوە خەنجەرێکی لە کورتە کەلەکەی ئەویان داوە کوشتوویەتی، ئینجا هاتووەتە فریای ئێمە، دەنگی ئەو دەمانچەیە هی ئەو بوو کە نێچیرەکەی خانمەکەی کوشت.

ئەمە هەرسێکمان ئازاییمان نواند، وەلێ ئەگەر حەقی خوات ئەوێ هونەری خانمەکە لە هەمووان زیاتر بوو. کچێک دەرودەشت و دز و جەردەی نەدیبێ بەو جەسارەتەوە دزە پەیدەست بکا ئازاییی چاک ئەوەیە.

مۆرینۆ گوریسێکی خستە قۆڵی دزەوە و سەری گوریسی بە میلی دوای ئەرابەوە بەست، وتی:

– تا ئەگەینە دێ ئەبێ گورگەلۆقە بکەی. هەرچەند میقائێللا وتی:

– گوناهە با سواری ئەرەبانەی کەین.

وتی:

– بمکوژی سوار نابێ.

مۆرینۆ سوار بوو لێمان خوڕی، لە ڕێ باس باسی جەردە و ئازایی بوو، نازانم چۆن بوو؟ هێشتا خەجاڵەتی ئەوەم و لە دڵما کرێیە بوو ئەمەی پێی بڵێن ئازایە درۆیێکم هەڵبەست، ئێستایش دەترسم درۆ دەرکەوێ (یاران ئەمە وەسیەت بێ لە درۆ بپارێزن درۆزنی لە هەموو چشتێک خراپترە) بە خانمەکەم گوت من هەر ئازا بووم و لە پێش چاوی سارینا نانوێنم. جارێکی تریش لێم قەوما، میقائێللا بە پێکەنینەوە وتی:

– هەی ناشێ، نەقەومابێ.

– شیایش و برایشەوە.

– چۆن؟ خۆ نەیانکوشتی.

– له سایەی سەری تۆوە کێ رایەی ئەکەوێت.

– سا کەواتە بۆمان بگێڕەوە با دزەیش گوێی لێ بێ. نەڵێ پیاوێکی حیز گرتوومی، با بزانێ پیاوی ئازا گرتوویەتی، داخی لە دڵا نەمێنێ.

– ڕۆژێ باوکم هەندێ پارەی لە سەر مسکێنەکان بوو، ناردمی قەرزی بۆ بێنمەوە، ڕێگای چوار سەعات لە ئێمەوە دوور، دێیێکی تر هەبوو لەوێ پارەکانم سەندەوە، هاتم بگەڕێمەوە ئێوارە درەنگ بوو دێکانی°° زۆرم لەگەڵ خەریک بوون، بەند نەبووم هاتم بەڕێوە تەنها چەقۆیێکی باریکم پێ بوو، میقائیللا پێ کەنی وتی:

– ئایەڕۆ، چۆن پیاوێکی وەک تۆ بە تەنها چەقۆیەکەوە کەوتیە ڕێ؟

– پیاوی ئازا چەکی بۆ چییە؟ تۆ ئەو چەقۆیەیشت پێ نەبوو.

– ئینجا وا بە ڕێدا ئەڕۆییم و گۆرانی ئەڵێم.

سارینا:

– ئەی کەمانەکەت لەگەڵ لێ نەئەدا؟

– خێر، هێجگاری لە ماڵی باوکم دەر نەکرابووم تا کەمانەکەم پێ بێ، گۆرانیم ئەگوت لە پەنای بنچکێکدا حەوت زەلامم لێ ڕاپەڕی.

سارینا:

– ئافەرین بنچک درەختی (توویا) نەبی. برادەر بۆت هەڵناسووڕێ تا زووە ڕاکە نەتگرن.

– چۆن ڕابکەم؟ بە جارێ دەوریان لێ دام، لەبەر ئازایی من هەر حەوتیان نەیانوێرا بێنە سەرم. یەکێکیان بانگی کرد:

– پارەت چی پێیە؟ بماندەرێ.

– جارێ وتم ئەمە حەوتن، دیارە تەنها پیاوێک دەرهەقەتی حەوت کەس نایێ، وا چاکە چیم پێیە بیاندەمێ، دوایی وتم: باوکم پێم باوەڕ ناکا ڕووت

کرابم چونکو لای ئێمە ئەسڵا[56] دز و جەردە نەبووە و نابێ.

دیسان[57] (تەرپیر) دەستی کردەوە پێکەنین وتی:

– حـافیـزەت[58] نیـیە، لەلایێکەوە ئەڵێیت حـەوت جـەردە دەوریان دابووم، لەلایێکی تریشەوە ئەڵێیت لای ئێمە دز و جەردە نییە.

تێ فکریم ڕاست ئەکا خراپ گیرام، بەرەکەت هاتمە دەست، وتم:

– ئەوانە جـەردەی لای ئێـمـە نەبوون، زانیـبوویان پارەم پێـیە، لە لایێکی ترەوە هاتبوونە سەر ڕێم.

– دەی ڕێکی خە، ئێ بزانین ئاخری بەچی گەیشت؟

– ئاخـری بەچـی گـەیشت، وەک شـێـر ڕاپەڕیم دەسم دایە چەقـۆ کـولە، هیـچیـان نەیانوێرا جم بدەن، ئەم هەویرەی من دەستم کرد بوو بە شـێلانی، ئاوی زۆر ئـەویست. بەرەکـەت دا گـەیشـتـینە دێکە، لەبەر قـەرەقـۆڵەکـەدا ڕاوەسـتـاین، ژاندرمەکان بە کـەمـاڵی ئیحـتـیـرامـەوە هاتن مـاندوو نەبوونی مـیقـائیللایان کـرد و دزەیان برد و ئێـمـەیش کـەوتینە ڕێ، زۆر نەڕۆیشـتین گـەیشـتـینە بەر دوو دەروازەیێکی زۆر گـەورە، کـە ئارابە لە گـۆشـەیێکیـەوە ئەچووە ژوورەوە، سـوار بە ڕمـەوە پیـا تێ دەپەڕی، خـانمەکـە فـەرمـووی ڕۆستەم ئەڵفرێد ئەفەندی ئەمە شاتۆیە کە هەر ئەتگوت نایگەینێ.

## بەشی دووەم

### شاتۆ

جارێکیان ڕاهیبەکەمان[59] داستانی "شاتۆ"ی بۆ کردبووم کە لە دەورەی دەرەبەگیدا قەسری قولەدار وەک قەڵای ئیستیحکام[60] دروست کراون و ئەو پرنسانە کە تێیدا بوون دائیرە و حەشەمیان بووە، من وام ئەزانی کە ئەمە خانوویێکە پەنجا شەست ئۆتەی[61] هەیە. کە گەیشتینە بەردەمی شاتۆ و خانمەکە وتی ئا ئەمە "شاتۆ"یە.

جارێ تێ نەگەیشتم شاتۆ چۆنە، دوایی کە پێی ڕاهاتم و شارەزا بووم وا بۆتانی ئەگێڕمەوە:

ئەم بینایەی ئێمە چووین ناوی شاتۆ لۆرانس- ە. لە ١٧٣٦دا دروست کراوە نازانم ئەو لۆرانسە کێیە؟ - (ڕەنگە لۆرانسی ١٩٣٥ بێ ڕووحیشی لەو زەمانەدا کاری کردبێ وەک سەرسەریی یەهوودی) خۆ من هێشتا میقائیللا و سارینام تەواو نەناسیوە تا لۆرانس بزانم کێیە؟

جارێ ئەو دائیرەی شاتۆیە کە من شارەزای هەندێکی بووم تا چاو کار ئەکا دەوراندەور دیوارێکی زۆر مەحکەمی بڵند وەک دیواری قەڵا دروست کراوە، دەروازەیێکی گەورەی تێ خراوە لە دەروازە ئەچییە ژوورێ شەقامێکی دە مەتریی شۆسە و ئەم بەرەو بەری شەقامەکە باغ و باغچە و درەختی گەورە و کەڵەگەت سەریان کێشاوەتە ئاسمان لەم بەری ڕێوە لای ڕاست دائیرە قاپییەوان و پاسەوان، لای چەپ دائیرەی خزمەتکار لەو لایشەوە جێگای مەتبەخ و ئەرابەچییە، هەر ئەمرێ لە ئەهل شاتۆوە بدرێ

زیلێک لە ئۆدەی خزمەتکاراندا هەیە بانگیان ئەکەن خزمەتکار دێ ئەمر بە جێی خۆی ئەگەیێنێ.

ئێمە کە گەیشتینە بەردەروازە، دەستە و دائیرەی شاتۆ هاتن بەپیرمانەوە، بە ماچ و مووچ و یەکتری لە باوەش گرتن، تا بیست دەقیقە لەو بەردەرگایە منیش وەک سەبەتەی پەت پچڕاو کەوتووم نە ماچ و مووچ و نە باوەش.

لە پاش چەندێ یەکێ لە ئافرەتەکان ڕووی کردە میقائیللا پرسی:

ڕۆڵەکەم ئەم ئەفەندییە کێیە؟

– پووریێ ئەوە هاوڕێمانە (ئەلفرێد موللەر).

کە وای گوت منیش شەپقەم داگرت، بۆچ لەو تەلاشەدا[٦٢] دەستم نەچێ بە کونی شەپقەکەما و تیا عاصی بێ، بۆم نەکرا تۆقەی لەگەڵ بکەم.

خانمەکەم وتی:

– پووریێ گیان، کەمانی چاک لێ ئەدا.

– ئۆێ براوێ، ئافەرین.

بۆ شاهێدیی ئەوسایەیش کەمانەکەم لە بن دەستما بوو.

کە میقائیللا تەعریفی منی کرد ئەوسایە پیاو و ئافرەت دەستیان کرد بە سەیرکردنی من، تا ئەوسایە وەیان زانیبوو ئاخۆ سوالکەرم یا دۆمەکان "چنگانە" کە دەگەڕێن بە دەرگانەوە کەمان لێ ئەدەن.

چونکو پانتۆڵێکم لە پێدا بوو سەر ئەژنۆکانی سێ جار پینە پینە کرابوو و هێشتا ڕیتاڵەکانی[٦٣] کاجووتەکانی پێوە بوو.

چاکەتێکی کورتم لەبەردا بوو خۆیشم نەمئەزانی ئەسڵی ڕەنگەکەی چییە. چونکو بە کۆنی کە کڕیبووم ڕەنگی دیار نەبوو.

پۆساڵەکانم ناڵچەیێکی پان و پەنجەی پێم لە لووتەکەیەوە دەرچووبوو.

شابقەکەیشم ئەوەندە کۆن، کۆن بوو، ئەوە بوو پەنجەی دەستم چوو بوو بە کونەکەیا.

باوەڕم پێ بکەن ئەوسایە کە خانمەکەیشم دیققەتی کرد ئەم هەموو کەسانە وام تەماشا ئەکەن ئەو لە من زیاتر تەریق بووەوە, وتی:

– ئەلفرێد ئەفەندی، تا جێت پێ نیشان ئەدەم، ئوستە "قاروون" میوانداریت ئەکا فەرمووە لای ئەو.

ڕوانیم زەلامێکی کەڵەگەتی تەنگە ئەستوور، سمێڵ زەرد، پێشم کەوت، ناچار دوای کەوتم چووینە دائیرەمێک چوار ئۆدە ئەم بەرە و ئەو بەر پڕ فەرش، مێز و سوراحی.. هەموو چشتێکی تیا بوو. تومەز ئەمە دائیرەی باغچەوانە، وتم ئینسان باغچەوانی شاتۆ بێ.

ئەو شەوە تێر نووستم، بەیانی لە خەو هەستام، کچە کارمەکەرێکی جوان و نازدار بە لەنجەولار هات، بوغچەیێکی ئاوریشمی لە بن باخەڵایە، وتی:

– خانم بۆی ناردی،

جارێ جلم لە بیر چووبووەوە، خەشیمانە لێم پرسی:

– تو خوا تۆ ئیسمی شەریفت چییە؟

– بەرتا، کارمەکەرت.

ئەمان چەند بە زبانی شیرین بوو و خۆیشی چەند لێ ئەهات، بەڵام من کە دڵم لای خانمەکەی خۆم بوو، ئەمانە بۆ مەزە تەماشا ئەکرێن، چاو پێخشاندنە.

کە (برتا) ڕۆیی بوغچەم کردەوە دەستێ جلی ئەفەندییانە، لەبەرم کرد، ئەمما نازانم چۆنم لەبەرکردووە. ئێوارێ دیسان عەینی کچ هاتەوە وتی:

– مادموازێل چاوەڕێتە فەرموو.

هەڵسام چووم بە ناو باغچەدا قەدەرێ ڕۆییم گەییمە دائیرەی شاتۆ،

سەرکەوتم، خانمەکەم لەبەردەرگا چاوەڕێم بوو، وا تێ بگەم بۆیە چاوەڕێی ئەکرد نەک سەهوێ بکەم، بە خێر هاتنی کردم و چووینە ژوورەوە، تەقدیمی کردم چا بوو نەیانناسیمەوە، ئافەرین کۆستومی تازە (لە هەموو شوێنێ کەوا بخۆیە) سێ ژن و پیاوێک.

یەکێکیان ساردینا (تەڕپیر)، دووەم، پووری خانمەکەم، ئەویترم نەناسی، پیاوەکەیش مێردی پووری میقائیللا بوو، پیرەمێردێکی ڕیش سپیی نوورانی - زوج الکبیر -[٦٤] پیاوەکە بە ڕوویێکی مەردانەوە بە خێر هاتن و خۆش و چلۆنییێکی گەرمی کرد. هەندێکی پێ چوو سەری نایە بناگوێی ژنەکەی بە گوێیا سرپاند و ئیشارەتێکی برتایان کرد، برتا چووە دەرێ، هاتەوە سینییێکی زێڕ بە دەستەوە، ئەمە مرەبیا بۆ من دێنێ، ڕوانیم لەسەر سینییێکی زێڕ قاپی مرەبا و لە پیاڵەیێکدا چوار پێنج کەوچکی شیرینی و لە پیاڵەیێکی تردا تەنها ئاوی تیایە، وەمزانی ئەم کەوچکانە هەمووی بۆ من و بۆ ئەوە دانراوە کە بە هەر کەوچکێ جارێک مرەبایەک بخۆم، کەوچکەکانم بە جارێ هەموو گرت بە دەستەوە و یەکە یەکە لە مرەباکەم هەڵئەدان، کەچی دیسان قەهقەهەی (تەڕپیر) پەیدا بوو، لە هەموو جێیێکدا ئەم پێکەنینە من ئەکا بە کەری نیوەزەڕ.

کەوچکەکانم دانانەوە و نەمخوارد، میقائیللا وتی:

- قەید ناکا تا ئەتوانی بخۆ.

من وتم:

- حەز لە شیرینی ناکەم.

ئینجا پیاوە گەورە ڕیش سپێکە لێی پرسیم:

- ئەزانی بنووسی و بخوێنیتەوە؟

وتم:

- بەڵێ.

وتی:

- له دەرێی شاتۆ لەسەر جاده دائیرەیێک هەیە ئەوە دائیرەی گومرگی ئێمەیە، مەئموورێکمان بوو (باباتۆم) یازده ساڵ مەئمووری گومرگ بوو، لەم چەند ڕۆژەدا مرد، ئەگەڕێین مەئموورێکی له شوێن بدۆزینەوە، وا تۆ هاتی، تۆمان له جێگای ئەو دانا، وتوومه دائیرەکەت بۆ پاکەوەکەن، فەرموو لەگەڵ ئەو پیاوە (باباپیەر) بچۆرە دائیرەی خۆت.

پیەر پێشم کەوت و من له دواوە، دەرگای دائیرەی بۆ کردمەوە لەسەر سالۆنێک دوو ئۆدە بەرابەری یەک ئۆدەکان هەموو پڕ فەرش و مۆبێلای جوان و مێز و ئاوێنه و تاقمی توالێت، یازیخانەیێکی[٦٥] دروست و شیک، ئەسکەملەیێکی فرفرۆکەیی، کە له سەری دانیشتی بە هەموو لایێکدا ئەتوانی بسووڕێیتەوە.

لەسەر ئەسکەملەکە دانیشتم، له کورسیی نیابەت خۆشتر و دائیمەتر، بەم لادا سووڕامەوە، بەو لادا سووڕامەوە، بانگم کرد _ بابە وەرە سەیری کوڕە نابەکارەکەت کە، کە ئەتگوت بە هیچ نابی، هێشتا ئەمە ئەووەڵمانە، ئێ فرەشی ها له ماڵ.

سەیری قەید و قیوودی بابا تۆمم کرد (فلان ئەرابە زەخیرە له فلان جێگاوە هات و چوو بۆ فلان جێ)، ئەمەندە ڕەسمی وەرگیرا.

ئەمە ماددەی قەید و قیوودی بوو، بەلام تەرتیبی ئۆتە و یازیخانەی کوێز و لامپا و سوراحی و مێزی ئالامووەدی زۆر ڕێک بوو، تەماشام کرد دۆلابێکی قەد دیوار، کە کردمەوە، بوغچەیێکی گەورە و لەناو بوغچەکەدا عەزیزێکی ئاوریشمی سپی (ڕۆب دوشامبەر) ئوربەی هۆدە یەعنی لبادەی ماڵەوە و جووتێ سۆڵی چنراو.

بە فرسەتم زانی، دەست بەجێ ئەمانەم لەبەر کرد و شەوکڵاوم نایەسەر (تاقیە)، تەماشام کرد تەقویمێک بە قەد دیوارەکەوەیە، ڕوانیم بە پێی ئەو

تەقـویمە ٢٨ی کـانوونی ئەووەڵە، وتم وا ئەمـە تەواو ئـەبێ لەسـەر ئەمـە بە مـەرەکـەبی شین لە دیوارەکە بۆ خـۆم تەقویم ئەنووسـم، بەڵام بیسـتـبـووم لە کانوونی ئەووەلدا بەفر و باران ئـەبێ، کەچی هـەمـوو ڕۆژێ هـەوا خۆشـە، وام ئەزانـی لێـرە لـە کـانووندا باران نـاباری، ئەو ڕۆژە کــە لە مــاڵ هاتبــووم نەمپرسیبوو چەندی مانگە.

لەم خـەیاڵانەدا بووم، وتم با جارێ با سـبیلێ تێ کـەم و هێشـتا تووتنـەکەم هەڵنـەگـرتبــووەوە، یەکێ تـەق تەق بە پەنجـە لە دەرگـاکـەی دا، منیـش لەبەر خۆمەوە وتم:

– (ئانترە) وەرە ژوورەوە.

کە هـاتـە ژووری، کێ بێ چاکە؟ مـۆرینۆ. لە دڵی خۆمـا وتم ئاە وەڵڵا ئێسـتا تووتنەکەی خۆی ئەناسێتەوە.

هـەر وایش بوو، کە هـاتە ژوورەوە وتـی:

– ئەوە سبیل ئەکێشی، لە توتونەکەی منە.

وتم:

– توتونەکەی تۆ لە کوێ بووە؟ زاواکەی خانم دایمێ.

– زاوای خانم توتون ناکێشـێ.

– مۆرینۆ لێرەیش سەرم به ڕەحەت نایێڵی.

– ئای، ئـای وا زوو لە خــۆت بایی بووی ئەگــەر باوکـی خــۆت نـەدییــایێ نەتئـەزانی کوڕی کێیت، ئەتگوت کوڕی سـەیفندە بەڕۆژی[٦٦]، هەڵسم پانتـۆڵە دڕاوەکەت بخـەمە بەردەمت.

لەسـەر ئەمـە تووڕە بووم، ئەو ڕۆی، ڕاکشـام، یـەکێکی تر لە دەرگـای دا لە قینی مۆرینۆ جوابم نەدایەوە، گوێم لێ بوو وتـی:

– نوستووە، بابچم بە خانم بڵێم نوستووە،

بە دەنگیا ناسیمەوە (بەرتا)یە، بانگم کرد:

- ئامان نەتکردبێ وا دێم.

گەڕایەوە وتی:

- مادموازێل ئەفەرمویێ تەشریفی بێ بۆ نان خواردن.

منیش لە خۆشیانا هەڵسام هاتمە دەرێ، تەماشایێکی سەری کردم تاقیە و پێم تەرلگی چنراو دەمی خۆی ئاخنی، بەڵام لە زگیا قوڵپی هەڵئەدا، پێشم کەوت و ڕای کردە سەرێ کە چووم بۆ سەرێ بۆ ساڵۆنی شاتۆ، جارێ لە مەتبەخ سەر قژنە سەر قژنە سەریان لێ ئەهێنامە دەرێ پێ دەکەنین و بە سینی دەفیان لێ ئەدا، دەمزانی کارنواڵە (کریسمیس)ە، زاتەن تەقویمەکەیش ئەو ڕۆژە بوو. لەوێ تێ پەڕیم خزمەتچی لەم بەر و لەو بەرەوە ئەهیلکانەوە[٦٧]، هەروا سەرم سڕ ما.

هێجگار سەرم کرد بە ئۆدەدا، ئەووەڵ کوڕ سارینا دیتمی، بڕایەوە ئینجا بە پێکەنینەوە هەڵسا کردی بە قیامەت، تێ فکریم خانمەکەی منیش کە تا ئیستا پێم پێ نەکەنیوە ئەویش ئەکوڵێ.

لە هەموو لایەکەوە لێم کەوتنە گاڵتە، منیش هیچم پێ نەما گەڕامەوە هەر چەند مێردی پوورەکەی بانگی کرد نە گەڕامەوە، هاتمەوە ئۆدەکەی خۆم تێ فکریم، بەرنا هات وتی:

- وتی خانم ئەفەرموێ جلی لەبەر کا و بێت نان ئەخۆین لە سەری ڕاوەستاوین.

نیازم بوو نەچم، بەڵام بێ ئەمریی خانمم پێ ناکرێ، ناچار هەڵسام چووم لە ڕێ تووشی مۆرینۆ هاتم، وتی:

- تو خوا ڕاست ئەکەن ئەڵێن بە جلی (کارنواڵ) مەسخەرەیی کریسمیسەوە چوویتە سەر سفرە؟

- چی بکەم نەشارەزا بووم.

- ئەوە خوای من گرتتی توتونیشت لیٚ دزیم و دەریشت کردم.

- ئینجا هەر ئەمەمان پیٚ دەویست تو خوا تۆیش برینم بکولێنەوە.

- خێـر ئەوە گاڵتـەم لەگەڵ کـردی، کەسـمـان ئادابی خزمـەتمان لە زگی دایکمان دەرنەهێناوە، دە فەرموو سەرکەوە سەرکەوە تۆ ئەمەندە دڵساف بی دوایی بە ڕۆژی خۆت ئەگەی.

سەرکەوتم ئەما چە سـەرکەوتنێک دڵم لە مستما بـوو، ئەگەر کارەکەرێ لەو وەقـتـەدا خـوویێکی لیٚ بکردمـایە بە لادا ئەهاتم، سـەرم کـرد بـە ئۆدەدا، ئیحتیاج ناکا من بۆتان بگێڕمەوە، خۆتان ئیتر تیٚ گەیشتوون کە تەڕپیر و قـەهقـەهە لێم بوون بە مـاری قـەهقـەهە، بەرەکـەت دا ئەم جـارە خـانمەکـەم نەهاتە پێکەنین فەرمووی:

- فەرموو ئەفەندی.

- زۆر تەشەکوری تۆ ئەکەم.

دانیـشـتم ئەمما زۆر بـە شـەرمـەوە، زاواکـەی خـانمـەکەم خۆش و چلۆنیی لەگەڵ کردم، جوابم دایەوە، وتی:

- با ئەمڕۆ قەیدی بکەین کە دەستت بە ئیش کردووە،

ڕووی کردە خزمەتچییەکە وتی:

- بەرتا، ئەمڕۆ چەندی مانگە؟

من لە پێش بەرتادا جوابم دایەوە وتم:

- ئەمڕۆ ٢٨ ی کانوونی ئەووەڵە.

- چۆن ٢٨ ی کانوون؟ بۆچ ساڵ ئەگەڕێتەوە؟

- ئەفەندم تەقویمی ئۆدەکەی من وا دەنوێنیٚ.

دیسـان تەڕپیـری دوابڕاو پێکەنینەکـەی لە دەسـتـیـا بوو، دایە قـاقـا، خانمەکەم وتی:

- ئەلفرێد ئەفەندی، ئەوە تەقویمی پارە،

ئینجا پەرتا وتی:

- ئەمڕۆ ٣ ی ئەغستوسە.

منیش وتم:

- عەفو ئەفەرموون کەواتە منیش تەقویمەکەی خۆم تەسحیح بکەم.

- کام تەقویم؟

- لە دیوارە سپییەکە بە مەرەکەبی شین تەقویمێکی سابیتم دروست کردووە.

- کورە نەتکردبێ چۆن لە دیوار تەقویم ئەکرێ؟

- بەخوا کردوویشمە و بڕاوەتەوە، کەواتە بابچم ڕەشی بکەمەوە.

- جارێ با نان بخۆین.

هەڵسایین چووینە سەر سفرە لە سەرەوە داماد[٦٨] ئەفەندی دانیشت و لای ڕاستییەوە سارینا و پووری خانمەکەم و لای چەپەوە میکائیلا و من هەموو دەردێکم لەبیر چووەوە کە لە تەنیشت میکائیلاوە دانیشتم، ئاوا سەرم لێ بەرز کردەوە و بە پێ بە مەقام لە تەختەی فەرشی ژوورەکەم ئەدا، سارینا لە زگی خۆیا ئەکولا، هیچ خۆم تێ نەگەیاند، کاسەیێکی زلیان شۆربا هانی، هەر کەسە کەوچکێکی شۆربا تێ کرد و کردە قاپی خۆیەوە، منیش کەوچکێکی چێشتانی (م بۆ خۆم) تێ کرد، برا کە خواردم ئەمەندە بە لەزەت بوو، کەوچکێکی تریشم تێ کرد ئەویشم خوارد، جاری سێیەم خەریک بووم تەبەقەکەم پڕ کەمەوە میکائیلا بە دزییەوە دەستێکی تێوە ژەندم، جا، بزانە چەند زیرەکم وا تێ گەیشتم کە ئەڵێ دەی لە چاوی منت کەوتبێ ئەوەندە بخۆ تا تەڕپیر شەق ئەبا، سا کەوچکم داهێنایەوە، میقائیلا ناچار مایەوە ئینجا بە زبان وتی:

- ئەلفرێد ئەفەندی بە شۆربا خۆت تێر مەکە، چشتی خۆش لە دواوەیە.

[illegible] دوای ئەوە گۆشت هات، میوە هات، چی هات، چی هات!

ادم بووە کوردە نامووسی ئەمەندەم خوارد کەمەری پانتۆڵەکەم شەقەیێکی کرد بچڕا، هیچ ئاشکرام نەکرد تا هەستاین ئیتر بەند نەبووم، دەستێکم بە پانتۆڵەکەمەوە گرت و چوومە ئۆدەکەی خۆم. خۆم لێ خاڵی کردەوە و لێی ڕاکشام نوستم، ڕووم نەهات جارێکی تر عەزیزییەکەی پاپاتۆن لەبەر کەم، چونکە ئەو پەندەی بەسەر هێنابووم.

## بەشی سێیەم

بەیانی لە خەو خەبەرم بووەوە مۆرینۆ هات وتی:

– ئێ.. ئێوارە ئەو هەموو شۆربایەت کردە کوێ؟

– ئەرێ کـردمــە گــۆڕی مــردووی تۆ، تۆیش لێم بووی بە سـارینـا، با سارینات لێ مارە کەین.

– وس، وس، مردووت مرێ بەم قسانە سەری من و خۆیشت بە فەتەرات[٦٩] ئەدەی، جارێ دەنگ مەکە تا شاییەکە دەبینین.

– شاییی چی؟

– حەو، سبەینێ شاییە و هەڵپەڕکێ، خۆت حازرکە بزانم چە مەقامێک ئەزانی؟.

– سێ پێـیی باش ئەزانم، ئەمما تو خـوا پێم بڵێ شـاییی کـێـیــە؟ دڵم دەرپەڕی.

– دڵت بۆچ دەردەپەڕێ؟ تۆ چیت لێ قەوماوە؟ شاییە و وەسسەلام؟

– توخوا مۆرینۆ ئەگەر پێم نەڵێیت.

– کورە ئاخر بەتۆ چی؟ سبەینێ ئەیزانی.

– چۆن؟من تا سبەینێ نەزانم.

– تۆ بە تەلاش دیاری، خۆت بگرە سبەینێ ئەیزانی.

هەرچیم کرد بێهوودە بوو، قەرارم دا هەرچۆنێ بێ ئەبێ بیزانم.

ها، تا ئێستا هیچ لە چێشت کەرەکان نەدواوم، ئەوەیش لەبەر ئەوەیە کە من لەسەر سفرە لە تەنیشت خانمەکەمەوە دانیشتم، ئیتر چۆن بێژم دێ لە

ئاشـچی[٧٠] و مـاشـچی بدووم، بـەڵام ئەمـڕۆ هۆم کـەوتە ئەوان، خـۆ نـاچم بە میکائیللا بڵێم سبەینێ شوو بە کێ دەکەی؟

ناچار چوومە لای چێشتکەرەکان تێ فکریم هەموو ئیشیان بە دەستەوەیە.

لە خۆمەوە وتم:

– خوا قوەتتان بدا.

– کارت ڕاست بێ.

هەروا لەبەر خۆیەوە ئەوەی گوت هیچ ئاوڕی لێ نەدامەوە، عەجائیب؟ من ئەلفـرێد مـوللـەر خـۆ ئەزانن کـام ئەلفـرێد مـوللەر ئـەفـەندی؟ ئەوەی کـە لە سـفـرەدا لە تەنیشت میکائیللاوە دانیشـتووە، جـا، وەرە ئەم پیـاوە بەو، وات جواب بدەنەوە.

تەواو قینم هەڵسا وتم:

– وادیارە زۆر سەرتان قاڵە.

– بەڵێ.

– چشتێکتان بە دەستەوەیە.

– بەڵێ.

– چییە؟ زیافەتە؟

– بەڵێ.

– شاییە؟

– بەڵێ.

– شایی کێیە؟

– بەڵێ.

– کێ شوو دەکا؟

– بەڵێ.

جـا، وەرە مـەپچـڕێ جـەنابـی ئەلفـرێد مـوللەر، چێشـتکەریش گـوێی لێ ناگرێ، خەبەرێکی ڕاستی نانێتە مشت.

نەختێ ڕووی خۆم لێ گرژ کرد نیوە هەڕەشەیێک تێم خوڕی:

– نابێ شعوورتان بێ منم من؟ پێم بڵێن کێ شوو دەکا.

– کە نەزانین لە خۆمانەوە کێت بۆ بدەین بە شوو؟

– ئەمـە چ عـەقڵ و کـەمـالێکە پیـاو لەم شـاتۆیەدا بێ و لـە هیچ نەزانێ، تێ فکریم ئاشــچی لە من تووڕەتر، وتی: خـۆ تۆ هێـشـتـا جـێی کنگت گـەرم نەبووەتەوە چاوت لە کـێـیـە کـە نەتـەوێ شـوو بکا؟ وا دیارە پیـاوێکی زۆر هەرزەچەنەی.[71]

ئۆخ وا وەرمــان گــرت، هەرزەچەنە، ئەگــەر ئێـوەش هـەرزەچەنە بن و لە دەمتان بترازێ بڵێن ئەوا فلان شووی کرد، هـەردوو لامان ڕسکارمان ئەبێ، کە زانیم لە مـانـە هیچ هەڵناکرێ، هاتمە دەرێ، خزمـەتچیی ئۆدەم دی لەوم پرسی چی هەیە؟ چی نییە؟

جـارێ پێم بڵێ تۆ دەخڵت بەسـەرمنەوە چییـە؟ دوای ئـەوە ئەگەر کـەسێ شوو بکا بە تۆ چی؟

ئەمیش نەغمەیێکی تر، ئەگەر ڕاستت دەوێ زۆریش ناحەقیان نییە، بەلام هاوار من ئاگرم تێ بەربووە نانیشێتەوە سا، خوا و ڕاسـتـان (بەرتا) پەیدا بوو بە ڕوویێکی خۆش و شیرینەوە ڕووم تێ کرد وتم:

– چۆنی؟ چاکی؟ بە کەیفی؟ لە کوێوە دێیت؟ و کوێ دەچی؟

بەرتا قەت ئەمەندە خۆشی و چلۆنیی بە گەرم نەدیبوو، عەلەلعادە وتی:

– تەشەکورت ئەکەم چاکم ئەچم هەندێ فەرمان بە ئاشچییەکان ئەدەم.

– ئۆو منیش لە شوێن ئەوە ئەگەڕێم ئـەمە چییـە؟ ئەڵێن شـاییـە، زیافـەتە چییە؟

- بەڵێ هەردووکیانە.

- کێ شوو دەکا؟.

-...

سا لەمەدا بووین قسەی لێ دەرکێشم لە سەرەوە تێیان خوڕی وتیان:

- ڕاکە.

ئیتر خۆی نەگرت ڕای کرد.

دە یارەبی چە دەردێ تووش بووم هەمووی لەمە ئەترسم خانمەکەمم لە دەست دەرکەن، هەر چەند کە هەرچی ئەمە ببێت بە قەد سارینا پێ دەکەنێ من لە کوێ و پرنس لە کوێ؟ بەڵام ئەوانەی حەقیقەتبینن ئەڵێن ئافرەتێ کە بتوانێ خۆی بەخێو کا لە شوێن مێردێ ناگەڕێ تڕ و دەعیەی بەسەردا بنوێنێ، کەسێکی دەوێ کە تەنها بە مەحەببەتی ئەوەوە دنیا ببینێ و ڕۆحی خۆی بە دەورا بگێڕێ.

ڕاست من لەوانەم کە میکائیللا لە دووم بگەڕێ جارێ بووم بە پیاوێ کە میکائیللا خۆی ئەفەندیم پێ دەڵێ، وا ئێستا وەزیفەیشم هەیە، ئیتر چی؟ ئەنووسم، ئەخوێنمەوە، لە جوغرافیادا شارەزای وڵاتان بووبووم وا بە چاویش دێم، هەبێ و نەبێ ئەمە تەدبیری زاواکەی خانمەکەمە خوا بۆی ناردوون خەریکن شایێکی ئەنتیکە بکەن هیچ کەس ناوی زاوا و بووک نەزانێ تا شەوێ بانگم کەن بڵێن وا میکائیللا خۆی تۆی پەسند کردووە، ئەمشەو ئێوە بووک و زاوان، مەرامیان ئەوەیە بزانن من شادمەرگ[٧٢] ئەبم یا نە؟

جا، کەواتە لە ئێستاوە من تەشەکورنامەیێکی بە شیعر بۆ موسیۆ ڕێک خەم با بچمە جێی خۆم ئەینووسم، بیستوومە عیشق زۆر کەسی کردووە بە شاعیر، با منیش یەکێ بم لەوانە، هەر لەو ناوەڕاستی حەوشەوە خولیای عیشق و شیعرم کەوتە کەللەوە، سەرەکەم دامەزراند:

شاتۆ لەگەڵ شا، تۆ یەعنی شاتۆ

کەوابێ بڵێیم بە سەوقی تاڵع ڕێم کەوتە شاتۆ، نە، نە، ڕێم نەکەوت هێنامیانە شاتۆ. ئەمەش قەیتانێ لە ئەندازە سەر ئەکا بڵێن هاتمە شاتۆ. ئای ئای، ئەگەر بڵێم هاتم ئەبێ وەک قەرەجە کەمانچەژەنەکان بە سواڵکەری هاتبم.

ئۆف، خوایە شیعر لە کەمان لێدان زەحمەتترە.

جارێ هێشتا ئەووەل (میسرەع) بووە شیعر، خۆ قافییە لە وەزن گرانترە، بابە با شیعری تیا نەبێ.

هەر وا بە زبان بڵێم جەناب سەروەر و پەناوەر لە هەرچەندە پادشاهان و ئیمپراتۆ و قراڵ و دەرەبەگیان هەیە کەس نەیتوانیوە چشتێکی وا گرانبەها و نایاب ببەخشێ. نە، نە ئەمەیش نەشود کەسێ چە ڕایەیێکی ئەکەوێ خانمەکەی من ببەخشێ، نیهایەت ئەم زاتە ڕاهبەری و دەلالەت ئەکا با بڵێم بە دەلالەتی تۆ.. ئەوە دەلالەتیش دەلالییە قەید ناکا وا ئەڵێم، لەو خەیاڵە خۆشەدا بووم دەستێ لە شانم کەوت، کە چاوم هەڵبڕی ڕوانیم ئوستە پیەرە وتی:

– ئەفەندی، ئەوە ئەمەندە لێرەدا وەستاوی چی لێک ئەدەیتەوە؟ ئاخۆ ڕەملی چی ئەهاوی؟ یا بیری بەستەی خۆش ئەکەیتەوە؟ سبەینێ لە شاییکەدا بیڵێی.

– سوبحانەڵڵا دیسان هەر بەستەکە و نەقەراتەکەیە توخوا ئەگەر ڕاستم پێ نەڵێی بووک کێیە و زاوا کێیە؟

– زۆرت نەماوە سبەینێ تێ دەگەی.

دە ئینجا وەرە شێت مەبە و مەدەرە کێو، ئەمیش دەڵێ سبەینێ.

کورە، هەی سبەینێ هەمووتان بەشەربێ ئاخر نابێ یەکێکتان لە دەمتان بترازێ و ئەم تەلیسمە بشکێنن، سبەینێ، سبەینێ ئەمەیان هەموو بە جارێ

لەبەرکردووە. وتم:

– ئوستە پیەر، ئەوا دیارە سبەینێ شاییە، هەمووتان لە یەکئاواز ئەمە دەڵێن و لە هەرچی ئەپرسم ئەڵێ سبەینێ ئەیزانی و بەوە منیان خستووەتە مەراقەوە، با سبەینێ نەبێ ئەمڕۆ بێ، چی دەبێ پێم بڵێن.

– کەسم نەدیوە وەک تۆ کارێ کە عائید بەو نەبێ ئەوەندە لە سەری بکەوێتە جوستوجوو، چیت لەمە داوە؟ خۆ من بۆیە نەهاتووم پێت بڵێم شاییە، بۆ ئەوە هاتووم خەبەرت بدەمێ ئەرابەیێکی زەخیرە لەبەر دەرگا وەستاوە تەشریفت بێ، ڕەسمی گومرگی لێ بستێنە.

که ئەمەی گوت دەستبەجێ جدییەتێکی وەزیفەشناسیم بۆ پەیدا بوو، یاڵڵا دائیرەی خۆم هەرچی موعامەلەیێکی بۆ بریمەوە، لێی ڕاکشام چوومەوە سەر وەزن و قافیەی شاتۆ و شیعری تەشەکورنامە، ئەم نەختە جدییەتی وەزیفەیە هەموو وەزن و قافییەی لەبیر بردبوومەوە، سەرلەنوێ چەند شیعرێکم ڕێک خستەوە، تا ئێوارێ لە بەحری شیعردا بووم، ئێوارە (برتا) هات وتی:

– بانگت دەکەن.

به پەلەپەل هەڵسام کە چووم تێ فکریم دیسان هەر ئەو چوار کەسە کە میکائیللا و پووری و زاواکەی و تەرپیری نازەنین (!) بە ئوسووڵ چووم دانیشتم، هەموو خۆش و چلۆنییان لەگەڵ کردم، دوای ئەوە موسیۆ وتی:

– ئەی سبەینێ شاییە تەبیعی تۆیش ئیشتیراک ئەفەرموویت.

وەکوو هیچ نەمبیستبێ وتم:

– شاییی چی؟

– ئای، نەتزانیوە سبەی ئێوارە زیافەتە، شاییە، بالۆیە، هەڵپەرکێیە.

– بەڵێ بە چاوان.

لەولاوە خانمەکەم هەڵی دایە فەرمووی:

– ئەڵبەتە لە هەموو کەس زیاتر ئەو پێی خۆشە کە بە شەرەف منەوە گۆرانی بڵێ، کەمان لێ بدا، هەڵپەڕێ، هەموو چشتێ بکا.

چی چی، بە شەرەفی میکائیللاوە کەمان لێ بدەم؟ دەک نەژیم میکائیللا شوو بە بۆرە زەلامێکی بێگانە بکا و من کەمان لێ دەم، دەک پەنجەی من و دەستی تەرپیر هەڵوەرێ ئەگەر من لە شایی میکائیللادا کەمان لێ بدەم، تەمام بوو بیدرکێنم خۆم ڕاگرت، بە دڵ ئەمەم گوت، بەڵام بە زبان هیچم نەگوت هەروا لە دڵی خۆما لێکم دایەوە زۆر چشتی وا هەیە ئینسان بە خێر و سەعادەتی دەزانێ، کەچی بۆی دەبێ بە شەڕ.

کاشکی ملم بشکایە، با جەردەکان بیانکوشتمایە و نەهاتمایە ئێرە، هەروا ئەمەم لێک دایەوە زبانم بەسترابوو تا چووینە سەر سفرە قوڕگم گیرابوو، ئیشتیهام بەسترابوو، هەروا بە زۆر چینەم ئەکرد تا هەڵساین لە پەنایێکەوە خۆم گەیاندە خانمەکەم پرسیم:

– زۆر زۆر ڕجا ئەکەم پێم بڵێ ئەم شاییە بۆ کێیە؟ و زاوا کێیە؟

بە پێکەنینەوە وتی:

– جارێ ڕاوەستە سبەینێ بێ ئەوسا تێ دەگەین.

کە ئەمەی گوت تاسێکم بە سەردا هات لەوێوە تەمام بوو بێمە دەرێ و تا پێم بڕ دەکا ڕاکەم، سەری خۆم هەڵگرم، میکائیللا تێ گەیی پەلی گرتم بردمیە ژوورەوە ناچار دانیشتم، جەناب موسیۆ حیکایەتێکی دەست پێ کرد بوو هیچ نەمئەزانی چی ئەڵێ. هەر وەنەوزم ئەدا تا درەنگێ، لە پڕ دەنگی بۆڕیەی ئەرابەی پۆستە هات و کاغەزێکیان هێنا دایانە دەست ئەفەندی و دای بە میکائیللا، خوێندیەوە، ئەمەندە نووسرابوو:

لەبەر هەندێ چشت کە رووی داوە و لە پاشا تێتان ئەگەیێنم سبەینێ شایی ڕێک ناکەوێ تا هەفتەیێکی تر.

کە ئەم کاغەزە خوێنرایەوە هەموو پێیان ناخۆش بوو من نەبێ، ئیتر من

هەڵسام هاتمە ژوورەکەی خۆم بە جلەوە لێی ڕاکشام نووستم.

بەیانی لە تەقەی دەرگا خەبەرم بووەوە لە دەرگایان دا، کردمەوە دیسان مۆرینۆ:

– ئۆۆ، سبەینێ بەخێر، کەمانچەژەن بۆچ وا درەنگ خەبەرت بووەتەوە؟

– هیچ ئیشم نییە، ئەمە عەرزی جەنابی ئەرابەچی بکەم کە بۆچ درەنگ خەبەرم بووەتەوە.

– توورە مەبە نەک پەشیمان ببیتەوە، چونکو ئەڕۆم، بەڵکو ئیتر یەکتری نەبینینەوە.

– بە ملی شکاوت بۆ کوێ دەچی؟

– جەنابم بە خێر پووری میکائیللا و مێردەکەی ئەبەم بۆ ویانە.

– ویانە دوورە؟

– ئەرێ، قەدەرێ دوورە.

– ئەی خانم؟

– ئەو لێرە دەمێنێ.

– ئەی من؟

– تۆیش بە ناسەلامەتیت لێرە پاسەوان ئەبی.

کە وای گوت هەر ڕاست بوومەوە و دەستم کردە ملی، وەختە بوو لە خۆشییانا بیخنکێنم، لە مانەدا بووین بانگیان کردم وتیان موسیۆ بانگت ئەکا، کە چووم خۆیان حازر کردبوو، ئامادەی سەفەربوون وتی:

– جەنابی ئەلفرێد موللەر ئەوا ئێمە ئەڕۆین، ئەم شاتۆیە بە ئەمانەت بۆ تۆ بەجێ دێڵم ئەبێ وریابی و سەرپەرشتیی بکەی.

میکائیللایش وتی:

– ئیتر ئەلفرێد ئەفەندی لە عائیلە مەحسووبە، ئەڵبەتە بە دەماغی ئێوە

خزمەت ئەکا.

سەرتا نەئێشتێنم ئەوان ڕۆیین و ڕەوانەمان کردن، کە گەڕاینەوە، ڕووم کردە ئۆدەکەی خۆم، خانمەکەم فەرمووی:

– ئەوە چی دەکەی؟ بۆ کوێ مل ئەنێی؟ ئیتر تۆ نابێ لێرە بنووی، ئەبێ بێیتە لای ئێمە شەو ئاگاداریمان بکەی.

ئەی خوا تۆ هەر ئەو خوای دوێنێ لە چە دەرد و خەفەتێکدا بووم و ئەمڕۆ وا خانمەکەم هاتووە قۆڵم ئەگرێ ئەمبا بۆ لای خۆی، چونکو زەریف[٧٣] باوەڕم نەدەکرد دووبارە پرسیم:

– چیت فەرموو؟

– تا ئەفەندی زاوامان دێتەوە تۆ ئەبێ بێیتە ژوورەوە، لەوێ بنووی.

– لە چە ئۆدەیەک ئەنووم؟

دیسان تەڕپیر و پێکەنین بەرابەرم وەستان، تەڕپیر وتی:

– مەرامت[٧٤] چییە ئەفەندی؟ ئەڵبەتە جێگایێکت پیشان ئەدەین، خۆ بەخێر ناتکەینە باخەڵ میکائیللاوە.

هەر وا لە ڕاستی خۆم وشک بووم، زبانم بەسترا هیچم نەوت، میکائیللا فەرمووی با بچینە سەرێ، سەرکەوتین، ئۆدەیێکی گەورە بوو، تەڕپیر و خانمەکەمی تیا ئەنووستن، لە تەنیشت ئەویشەوە ئۆدەیێکی تر بچووک بە منیان گوت:

– ئەوە ئۆدەی تۆیە، جارێ بابچین دانیشین، کە خەومان هات تۆ ئەچیتە ژووری خۆت.

چووین دانیشتین، من لە خۆمەوە وتم:

– ئای دیسان هەر سێ هاوڕێکەی سەفەر ماینەوە، تەنها مۆرینۆمان کەمە.

هەروا بردمانە سەر تا ئێوارە من لە ناوەڕاستی خانمەکەم و تەڕپیردا دانیشتبووم و شاییش پەکی کەوتبوو، ئیتر مەپرسە چەند بە دەماغ بووم، لووتم قەندیلی ئەکێلا، لە نان بووینەوە، دانیشتین تا وەختی نووستن، هەر من قسەم ئەکرد و تەڕپیر پێ دەکەنی، وتم:

– خانمەکەم ئەگەر بە حیساب بووایە مادام سارینا پارەی زۆر ئەکەوتە سەر، ئەووەلا من قسەی بۆ دەکەم ئەو پێ دەکەنێ، ئەبووایە پارەی بدامایێ، دووەم ئێستا ئەبینم سارینا عەینەن ماکینەی پێکەنینە، ئەگەر ئەم ماکینەیە بە بەنزین بگەڕایە، مەسرەفێکی زۆری دەبوو، بەرەکەت دا، نە من پارەم دەوێ، نە ئەویش بەنزین.

خانمەکەم پێ کەنی، سارینا وتی:

– سەیر کەن (پەڵووڵە)[٧٥] یش دەم ئەسووتێنێ.

ئینجا تێ فکریم وادەی خەوە هەڵسام وتم شەوتان بە خێر، کە من نزیکتان بم ئەڵبەتە ناترسن، من جار جار سەرتان لێ ئەدەم.

– ئەمەم گوت هاتمە دەرێ.

بەڵام تا گەییمە ئۆدەکەی خۆم قەهقەهەی تەڕپیر دەنگی ئەدایەوە، ئیتر نووستم، بەیانی کە هەڵسام خۆم گرد کردەوە، یەکەوڕاست بگرە ئۆدەی ئەوان، سەرم کرد بە ژوورا، ئەمجارە لە باتی پێکەنین سارینا بانگی کرد:

– وۆحە، وۆحە[٧٦] چشتێ نەشکێنی.

– ئەمە مەعنای چی؟

– کوێری، چاوت نابینێ ئێمە هێشتا ڕووتین خۆمان پۆشتە نەکردووەتەوە،

ئینجا تەریق بوومەوە، هاتمەوە ئۆدەی خۆم تا ئەوان هەڵسان خۆیان کۆ کردەوە ناردیان بە شوێنما، ئەم جارە کە چووم لە پێشدا بە پەنجە لە دەرگام دا و ئنتەرمیان[٧٧]دا، چوومە ژوورەوە سارینا وتی:

– بزانە (نەقیزە)[٧٨] چۆن فێری (هۆرتەوبەرە)[٧٩]ی کردی.

– من بە نەقیزمێک هاتمە ڕمت، ئاخۆ خەڵک چەند نەقیزەی خواردبێ؟

قاوەڵتیمان کرد، تێ فکریم خانمەکەم نەختێ ماتە، وتم:

– ئارەزوو ئەفەرمووی هەندێ کەمانت بۆ لێ دەم؟

فەرمووی:

– باشە.

چووم کەمانم هێنا، خەریک بووم (ئاقۆرد)[80] بکەم پۆستەچی هات کاغەزێکی بە ناوی میکائیللاوە هێنا، وەرم گرت و وتم:

– بۆت بخوێنمەوە.

فەرمووی:

– جارێ با خۆم ببینم.

کاغەزی خوێندەوە، بە زبانی ئیتالیانە لەگەڵ تەرپیردا قەدەرێ گفتوگۆیان کرد، پاش ئەوە ڕووی کردە من، فەرمووی:

– ئای ئەلفرێد ئەفەندی حاڵی دنیا وایە، ئەمجارەیش گوێمان لە دەنگی کەمانەکەت نەگرت، سبەینێ ئەڕۆین.

– ئۆغور بێ؟

– بۆ لای پووردم.

هەر ئەو ڕۆژە دوو ئەرابە حازر کرا، خۆیان و دەست و پێوەندیان سوار بوون و بارگیرێکیان بۆ من هێنا سوار بووم و ئەبێ بە دوای ئەرابەکاندا بە غار بڕۆم، ئەی خوا داد.. لە شاتۆ هاتینە دەرێ.

دوو ئەرابە لە پێشەوە بە لۆقە[81] لێ ئەخوڕن، منیش لە دوای ئەوانەوە بە سواری و بە (گورگە)[82] ئاوزەنگی ئەکوتم دیتە کۆڵی سوارم[83] و تا ئەمڕۆ خۆمان کەریشمان نەبووە تا سواری بم، زۆر بە سەختڵەت ولاخم بۆ لێ دەخورا، هێجگار کە نازانێ من سوار نیم بە هەوەسی خۆی نەبوایە

نەدەڕۆیی، لەقەم لێ ئەدا هەڵی ئەتیزاند، بەهەر حاڵێ بوو تا ئێوارە دوور و نزیک ئەرابەکانم گوم نەکرد، دەمی ئێوارە زۆر دوور کەوتبوونەوە، هەر چۆنێ بوو خۆم گەیاندە ئەرابانەکە، هاوارم کرد:

– وا تاریک داهات، ئەسپەکەم ناڕوا، نەختێ هێواش لێ خوڕن،

تەڕپیری نەگبەت لەو سخڵەتییەشدا دیسان پێ کەنی، وتی:

– تۆ لەسەرخۆت وەرە.

دەک تەڕپیر خوا لەناوت با، وتم:

– لەسەر خۆ لێ خورم دوایی ئێوەم لێ گوم ئەبن چی بکەم؟

– تا ئەتوانی لێ خوڕە، کە دواکەوتی بە پرسیار ئەماندۆزییەوە.

– لەم چۆڵ و هۆڵەدا لە کێ پرسم؟ ڕێی دواوەیش نازانم تاکو بگەڕێمەوە.

تێ فکریم ســـارینا هەر ئەیەوێ من دواکـــەوم، ئینجـــا هاوارم بردە بەر خانمەکە، وتم:

– تۆ چارەی بدۆزەرەوە.

– من بڵێم چی؟

– سواری لای خۆتانم کە.

– ئەگەر جێگا ببوایە بۆچی سواری وڵاخم ئەکردی؟

– بارێ، یەکێ لە کچەکان کە سواری ئەزانێ بێت سواری ئەسپەکە بێ، من بچمە جێی ئەو، بیستوومە لە ئەورووپانی (ئامەزۆن) هەن سوارچاکی ژن، بەڵکو برتا سواری چاک بزانێ، با بێت سوار بێ.

هەموو بە جارێ دایانە قاقای پێکەنین، "خۆتـان ئەزانن من دڵم چۆن بووە بە خوێن، وا بە نەشئە پێ دەکەنن."

ئیتر چارم نەما، پڕ چاوم بوو لە گریان. ئەرابەکانی ئەوانیش تێ پەڕین، لە قـینا هەر ئاوزەنگیم لە بارگـیر ئەدا، ئەویش مـانی گرتبـوو چەقۆکـەم

دەرهێنا کردم بە پشت ملیا، لە تاوانا کەوتە چوارناڵە و منی فڕێ دا، خۆی بۆی دەرچوو.

لە تاو کەوتن و ئازاری سەر و لەشم قەدەرێ بێهۆش کەوتم، دوایی هاتمەوە هۆش تا تیاما بوو بانگم کرد:

- های خانمەکە، های خانمەکە بمگەرێ وا لێرە خراپ کەوتووم.

تەنها ئەوەی من ئەمگوت ئەو دەنگ و بانگ و هاوارە لەناو چەم و چغورد و دارستاندا دەنگی ئەدایەوە و هیچی تر.

دوای ئەم هاوار و بانگە هیچ چارم نەما هەستام بەملادا و بەولادا وەک هەروەلەی حاجییانی سەفا و مەروە ئەکرد، لە هیچ شوێنێکەوە بارگیر دیار نەبوو، جارێ دانیشتم تێر و پڕ گریام. نەختێ بە گریانەکە کوڵوکۆی دڵم دامرکایەوە، ئینجا هەڵسام هەرچەندە لێکم ئەدایەوە، نەمزانی ڕوو بکەمە کوێ؟ وردە وردە جوولام لە بەر خۆمەوە لێکم دایەوە خۆ ئێستا جارێ وا ڕابورد ئیتر من ناگەمە ئەوان، بارگیریش سەری خۆی هەڵگرتووە و ڕۆییوە جارێکی تر بۆم نادۆزرێتەوە با جارێ بچمە سەرشەقام، ئینجا بزانم ڕووم لە کوێ دەبێ؟ چونکو بارگیرەکە وای هەڵگرتبووم لە ڕێی دوور خستبوومەوە، کە هاتمەوە سەر شەقامەکە، ناوی خوام هێنا لای ڕاستم گرتە پێش، دیتە لە وڵاتی خۆمان بەپێخاوسی فێر بووبووم، پۆتینەکانم داکەند نامە باخەڵم، کەوتمە ڕێ، وردە وردە هۆشم هاتەوە بە خۆما بیرم کردەوە یاران خۆ مۆرینۆ کە پوورەکەی میکائیللای برد من لێم پرسی بۆ کوێ ئەچێ؟ ئەو گوتی:

- ئەیانبەم بۆ ویانە (ڤیەننا).

وا دیارە ئەوانیش کە ڕۆییون بۆ ویانە، چون من کە پرسیم ویانە ئەدۆزمەوە یاڵڵا و ویانە.

هەر وا بەم خەیاڵانەوە ڕۆییم، دوو سەعاتێکی پێ چوو، ماندوو بووم،

زۆریشم برسی بوو، نایشـزانم شـەو سـەعـات چەندە، خـواوڕاسـتـان لە پێشمەوە بینایێکی سێ قات دەرکەوت، وتم ئۆخ ئەڵبەتە ئەمە لەم سەرڕێیە هەبێ و نەبێ ئوتێلە، نانیش ئەخۆم و تا ڕۆژ ئەبێتەوە لێی دەنووم، لە دەرگام دا، دەنگی پیرێژنێکی دەنگنێر پرسی:

– کێیە ئەوە؟

– منم ئەلفرێد مولەر بەگ.

لێرەدا لە بیرم بوو جارێ پێیان وتبووم بەگ؟

– های های بەگی کوێی؟

– بەگی ناو ئەرابانەی میکائیللا.

– جـارێ ئێرە جـێی بەگ نیـیـە و مـیکائیللایش ناناسـم، خـوا ئەیزانێ بەگزادەی توونی حەمامی، یا گیرفانبڕی یا سەرسەریت چییت؟ بڕۆ بەڕێی خۆتەوە.

– بابە خوا هەڵناگرێ، تۆیش لێم مەبە بە تەرپیر، لەگەڵم ڕێ نەدەکەوت، بارێ تۆیش پێ بکەنە، بەڵام دەرگام لێ بکەرەوە ماندووم.

– خرتەخرت خەریکی دەرگاکردنەوە بوو تا دەرگای لێ کردمەوە ئاوی پێم داهات، کە دەرگەی کردەوە چی ببینم؟ تەرپیر ئەمەندە ئەستوور بوو ئەتگوت (کەندوو)ی نەزان کردووە، کەچەڵ، سووراو سپیاوکراو.

جارێ تێم ورد بووەوە لە نووکی پەنجەمەوە تا تەوقی سەرم پیاهەڵڕوانیم، ئینجا وتی:

– جلوبەرگ و تەقیە و غراواتت[٨٤] تازە و جوانە، بەڵام وەک لە کەر پەڕیبی سەرتاپات لە تۆزایە، ئەمانەت وا، پۆتینەکانت بۆ ناوەتە بن باخەڵت و بەپێ خاوسی بە ڕێدا هاتووی، وا دیارە تازە پیاکەوتووی فێری پۆتین نەبووی، کە وابێ ئەم جلانەیشت دزیوە.

وتم:

– خێر مادام. بەگێکم لە بەگەکانی کە خۆت ئەیزانی، بەڵام لێ قەوماوە، جارێ با بچینە ژوورەوە بۆت ئەگێڕمەوە.

– شەو لێرە ئەمێنیتەوە؟

– ئەگەر دام کەی[85] و جێورێم بەیتێ هیچ کوێ ناچم.

– منەتی تیا نییە، ئەمە ئوتێلە، هەرچی پارە بدا هەموو چشتێکی دەست ئەکەوێ.

لێکم دایەوە هەموو چشتێک ئەبێ چی بێ؟ جارێ نەمپەرژایە سەر مەعنا، پرسیم:

– شەوی چەندم لێ ئەسێنی؟

– نووستن قرانێک، ئەگەر نانیش بخۆی بە ئەندازەی زگت قرانێک، ئەمە نیو ڕوپییە، بەڵام ئەبێ لە پێشەوە پارە دەرکەی، چونکە زۆری وامان دیوە، هاتووە خواردوویە، نووستووە، لە پاشا وردە تری بۆ دەور کردووینەوە.

– زۆر ئەسەف بۆ تۆ کە لە ڕووی ئەلفرێد بەگدا ئەم گوستاخییە[86] دەکەی، من بە تەمام ببمە ساحێب شاتۆ و مۆرینۆ ئەرابەچیم بێ، ئێستە تۆ لەسەر نیو ڕوپییە ڕام ئەگری؟

کە وام گوت باوەڕی پێ کردم، وتی فەرمووە ژوورەوە. لە قاپی چووینە ژوورەوە، حەوشێکی گەورە و داڵانێکی پان و درێژ، فەرشەکەی گڵ، چوار پێنج ئەسکەملەی شکاو لە ئەسکەملەکانی قەلەندەرخانە کۆنتر و شکاوتر، قوتوولەیەکی[87] نەوتی ڕەش، گۆزەیەکی کۆنی دەم کەل، پیاڵەیێکی ئاو درزبردوو، مێزێ پێچکەشکاو، برێ داری سووتاندنی درابووە بەر، ئوتێلی سەرەڕێ ئەمە بوو.

بەڵام دەستەڵات چییە، لەسەر کورسی دای نام وتی:

– ئێ ئێنجا دەردی خۆت هەڵڕێژە.

– جارێ برسیمە، ورچی برسی یاری ناکا.

هەڵسا لە دەرگایەکی بچووکەوە چووە ژوورێ، کە هاتە دەرێ قاپێ ئاوی ئیستقانی کولاو و هەندێ کەلەرمی پیشاو و خەپلەیەکی نیوەبرژاو و ماسییەکی سلامووڕەی کەنیوی هانی.

بەم لادییی خۆمەوە دەستم بۆ هەرچییێکیان برد پەشیمان بوومەوە، خەپلەکەیش پارووێکم لێ خوارد بۆم قووت نەدەچوو، ئاوە گەرمەکەم کرد بە سەریا، بە هەزار نزگەرە بۆم قووت نەدەچوو، هەرچۆنێ بوو ئاوگیرم کرد، هێشتا نەهاتوومە ئەوە تێر دانیشتم هێواش هێواش بە پەلەپیتکە لە دەرگا درا، تەرپیر وەک کێچ ڕاپەڕی دەرگای کردەوە، دوو بەدشکڵی جەهەننەمی هاتنە ژوورەوە نوور لەناو چاویاندا نەبوو، من لە ترسا ئەلەرزیم، یەکێکیان وتی:

– ئەم کابرایە کێیە؟

نەمهێشتە بەر مادام من جوابم دایەوە وتم:

– خۆمانین.

وتی:

– چۆن خۆمانی، تۆش لە یارانی، یەعنی لە ئێمەی؟

– بەڵێ.

– کەوابوو خۆت گورج کە شکارێکی باشمان لە پێشەوەیە با بۆی بچین.

لە حەیبەتا لەرزیم وتم:

– برادەر من لە یاران نیم و لە عومری خۆم مریشکم ئاوەڕووت نەکردووە.

ئینجا ڕەفیقەکەی هەڵی دایە وتی:

– کەوابوو ئیشت چییە لێرە؟

– ڕێبوارم ڕێم لێ گۆڕا بوو خۆم کوتایە ئێرە.

ئینجا سەری نایە بناگوێی ئافرەتە ئوتێلچییەکە، بە سرکە هەندێ

ورتەیان کرد و ڕووی کردە من وتی:

- ئۆ ئۆ.. تێت گەیشتین، تۆ جاسووسی لە پێ و شوێنی ئێمە دەگەڕێیت.

- کورە پیاوەتیتان بێ من ئەلفرێد ئەفەندیم.

- ئێستا ئەفەندییەتیت نیشان ئەدەم، "خاتە " دەرگای ژێرزەمین بکەرەوە.

" خاتە" ناوی "ئوتێلچییەکەیە".

دەرگای ژێرزەمینی کردەوە و منیان لە پێپلیکانەی ژێرزەمینەکە فڕێ دایە خوارەوە، سەرەڕای ئەوەیش خاتە بانگی کرد:

-ئەوێ کووپەی شەرابی تیایە نەخەڵەتابی لێی بخۆیتەوە.

من (ترپ) کەوتمە خوارێ و خاتە دەرگای لەسەر داخستم. لە کەوتنە خوارەوەدا سەرسام بوویووم، ژێرزەمینیش ئەوەندە تەڕ بوو ڕتووبەت[88] لە هەموو ئەندامم کاری کرد. گەڕام بۆ چشتێ لە سەری ڕاکشێم هیچ نەبوو، لەسەر کووپەیێکی شەراب دانیشتم لێکم ئەدایەوە چیم بە سەرا هات، کە گوێم گرت لە سەرێ هەرایە، لە کونێکەوە ڕوانیم جەردەکان بوون بە سێیان و ئافرەتێکیشیان لە ناودا، بە هەرسێکیان لێی ئەدەن، یەکێکیان خەنجەری هەڵکێشا نایە سەرسنگی وتی:

- هەر دەتکوژم، ڕاست برۆ. ڕوویان کردە کوێ؟

ئافرەت لە ترسا چشتێکی گوت، بەڵام باش گوێم لێ نەبوو. جەردەکان وتیان:

- با ئەم ئافرەتە لێرە بێ، وا ئێمە دەچین بە شوێنیانا، ئەگەر ئەمە درۆی کرد، دێینەوە ئەیکوژین، خاتە ئەمیش بکەرە ژێرزەمینەکە.

خاتە وتی:

- ژێرزەمینەکە پیاوی تیایە.

وتیان:

- قەید ناکا.

خاتە وتی:

- کورەکەی ژێرزەمینەکە وەک بێ دەستەڵات وایە، با ئەو ببەمە قاتی سەرێ.

وتیان:

- چونکو ئەو کورە لووسە، ئەتەوێ بیکەیتە باخەڵی خۆت.

خاتە پێ کەنی وتی:

- کەوابێ هەردووکیان ئەکەمە نهۆمی سێیەم.

منی هێنایە دەرێ و لەگەڵ ئافرەتەکە کردینییە ئۆدەی سەرێ. کە سەرکەوتین و دەرگای لێ داخستین، چرایشمان نەبوو، قەنافەیەکم بەپەلەکوتێ دۆزییەوە و لەگەڵ ئافرەت لە سەری دانیشتین، لێم پرسی:

- تۆ چۆن تووشی ئەمانە هاتی؟

وتی:

- مەپرسە، من لادێییم، شەو لە سەر خەرمان ئەهاتمەوە تووشی ئەمانە بووم، وتیان: "دوو ئەرابە لێرەوە تێ پەڕین ڕوویان کردە کوێ؟". وتم "نازانم"، لەسەر ئەوە گرتمیان هێنامیانە ئێرە، لێرە وەختە بوو بمکوژن، ناچار وتم ڕوویان کردە دێی ئێمە، وا، چوون بە شوێنیانا.

- ئای دەخیل و ئامان، جا بە ڕاست تۆ دوو ئەرابەت دیبوو.

- بەڵێ، دوو ئەرابە بە لای خەرمانەکەی ئێمەدا تێ پەڕین، ئافرەتی تیا بوو.

- ئای نەتکردبێ، شوێنی میقائیللات پێ گوتبن. هەر ئێستا شوێنیان ئەکەوم سێیان نەبن شەش بن وەک کارە کۆڕیە هەر شەشیان سەرئەبڕم، ئەوان ڕایەیان ئەکەوێ بچنە سەر ڕێی خانمەکەم؟ هۆ دایکتان وا، باوکتان

وا، خۆتان ڕاگرن ڕامەکەن وا بۆتان هاتم.

ئیتر بێ ئیختیار بە ئۆدەدا ڕام ئەکرد و ئەم ئەڕاند و پەلاماری جەردەم ئەدا شێت بووبووم، ئافرەتی قوڕ بەسەر لە ترسا ددانەچۆقێی پێ کەوت، ئەلەرزی، وای ئەزانی شێتم، هاواری ئەکرد:

– ئای لە ڕێی خوادا مەمکوژە من چووزانم ئەرابە خانمی تۆی تیابووە.

– ئینجا پەنجەرەم هەڵدایەوە ڕوانیمە خوارێ، سێ نهۆم بەرزە و ئێمە لە قاتی سێیەمداین، گەڕام گوریسێ پەیداکەم پێی بچمە خوارێ نەبوو، هاتم بەرگی قەنەپەم پارچە پارچە کرد و پێکمەوە بەست وەک گوریس دام هێشتە خوارێ سەرێکم بەست بە پەنجەرەکەوە، خەریک بووم خۆم داهێڵم ئافرەت وتی:

– – بە خوا ئەگەر لە پێشدا من دانەهێڵی خەبەرت لێ ئەدەم،

ناچار لە پێشدا ئەوم داهێشتە خوارێ، لەنگەرم گرت لە دیوار نەکەوت، بە سەلامەتی گەیشتە خوارێ، لەگەڵ پێی نایە زەوی فڕکەیێکی کرد و وتی:

– (خاڵۆ)[89] تۆ جێت خۆشە دانیشە تا دزەکان دێنەوە، جوابی منیشیان بدەرێ بڵێ: "من دەربازم کرد."

– وتم حەقتە شەرتی دنیایی کە بە تەنها لە ئۆدەیێکی تاریکدا لازم بوو بەجێی بێنم قسوورم کرد، تۆیش زۆر چاکت کرد کە لەسەرم ڕانەوەستای بەجێت هێشتم.

دووبارە خەریک بووم خۆم دەرباز کەم، یەکێ لە دەرگای دا، خاتە بوو، وتی:

– چۆنی؟ نارەحەت نیت؟

وتم:

– چاکم.

وتی:

– ئافرەتەکە چی ئەکا؟

وتم:

– نووستووە،

– سا کەواتە با من بێمە لات،

وتم:

– زۆر نەخۆشم، یارای دانیشتنم نییە،

جوابم دا ڕۆیی، ئینجا هەڵسام منیش خۆم داهێشتە خوارێ، نزیک بە پەنجەرەی قاتی زەوی کەوتم لە دیوارەکە هەڵبەزیمەوە دوور کەوتمەوە، ئینجا کە دامی بە پەنجەرەدا هارەی کرد شووشە تێک شکا، تومەز جەردەکان هاتبوونەوە ڕایان کرد هاتن دایان گرتم قەدەرێکیان لێ دام، وتیان:

– خەریک بووی ڕاکەی لە شوێن ئافرەتەکە، کە زانییان ڕای کردووە، کەوتنە تەلاش، جارێ منیان خستە ژێرزەمینەکە و گوریسێکیان هێنا، توند توند شەتەکیان دام و بەستمیان بە کووپەی شەرابەوە، زۆر نارەحەت بووم هەرچۆنێ بوو قۆڵی خۆم کردەوە، سەری کووپەی شەرابەکەم لادا بە مست خواردمەوە، مەست بووم، کردمە گۆرانی و بەزم، خاتە هات وتی:

– ئەوە چی ئەکەی؟

– وتم ئاخر شاییی من و تۆ نییە؟ وا گۆرانی ئەڵێم.

خاتە پێ کەنی، چوو چرایێکی هێنا وتی:

– بابتکەمەوە.

کە تێ فکری نەبەستراوم، وتم:

– مەترسە من نابەسترێم.

بە هەزار ئاین و ئۆین بەدەمیەوە پێ کەنیم تا بردمیە ژوورەکەی خۆی کە

لە خوارەوە بوو، پەنجەرەی بەسەر کۆڵاندا بوو، ئەمتوانی لەوێوە باز دەمە کۆلان.

کە چووینە ژوورەوە وتم:

– تو خوا جارێ زۆر کولکم[10] با نەختێ بنووین.

ڕاکشاین ئەوم کردە خەو، هەڵسام چووم بۆ لای پەنجەرەوە وتم:

نزمە لەوێوە باز ئەدەمە خوارێ، دیتە شەو تاریک بوو، شووشەی پەنجەرەکەیش پاک بوو وەم زانی شووشەی پێوە نییە، سا سەرم کرد بە پەنجەرەدا و شرنقەی هەڵسا، تومەز شووشەی پێوە بووە بە جارێ شووشە خورد و خاش بوو و سەری منیش شکا، خاتە ڕاپەڕی وتی:

– ئەوە دیسان نیازت بوو ڕاکەی؟ سا بۆم ڕاوەستە.

بە خوا ئیتر نەمکردە نامەردی تا ئەو کەوتە خۆی من هەر لەو پەنجەرەیەوە بازم دایە خوارەوە بانگم کرد:

– خوا بتگرێ ئەگەر بەسەربەستی بەرتدامایە پارەی هەموو چشتێکم ئەدایتێ و لە باخەڵیشتا ئەنووستم، ئێستا منیش و پارەیشت لە کیس چوو.

من وام گوت، ئەو کردییە قیژە و هاوار های بیگرن دزە، منیش تا تیاما بوو ڕام کرد، نیو سەعاتی سەری دەستە ڕام کرد تا گەیمە دارستانێک، لام دا دانیشتم هەندێ حەسامەوە، هەر ئەوەندەم زانی تریەی پێ پەیدا بوو، لە ترسانا چوومە سەر دارێک، هێشتا تەواو خۆم نەشاردبووەوە، دوو زەلام پەیدا بوون بانگیان کرد:

– تارمایی سەردار، دێوی، درنجی، ئادەمیزادی چیت؟

وتم:

– کرمی دارم،

قەدەرێ پێ کەنین.

به پێکەنینەکەیانا، تێ گەیشتم کە جەردەکانی لەمەڕ خاتە نین، زۆر خۆشحاڵ بووم وتم:

- کارتان ڕاست بێ کە ئەوان نین.

وتیان:

- کێ نین؟

وتم:

- جەردەکانی لەمەڕ خاتە،

نیوە سەرگوزەشتێکی خۆمم بۆ گێڕانەوە بەزەییان پیاما هات وتیان:

- دە وەرە خوارێ برۆ، خوا ئاگادارت بێ،

دیسان کەوتمە ڕێ، قۆندەرەکانم لە ئوتێلی خاتە بەجێ مابوو بەپێ خاوسی ملی ڕێم گرت، ماندوو و مردوو، کەمانەکەیشم کە کەوتمە خوارێ شکا بوو. نەمئەزانی بە چی دڵخۆشیی خۆم بدەمەوە؟ سا زۆر ڕۆییم کەم ڕۆییم دەنگی کەڵەشێر هاتە گوێم، ئەگەر ئێوەش وا لێتان قەومابێ، ڕێتان گوم کردبێ و لە پڕ دەنگی کەڵەشێرتان بیستبێ ئەزانن چەند خۆش و مژدەدەر بووە، گەییمە بەرەوە ڕوانیم دێیێکی چل پەنجا ماڵی، وتم ڕەنگە لەم دێیە هەواڵی میقائیللا ئەزانم، ڕووم کردە دێ، هەر ئەوەندەم زانی زەلامێ بە تفەنگێکی درێژەوە بەرەو پیریم هات لوولەی تفەنگی ئاراستە کردم وتی:

- دەست هەڵبڕە.

دەستم هەڵبڕی وتم:

- چییە؟

وتی:

- بەم شەوە بەم قیافەتەوە چی ئەکەی لەم دەورە؟

وتم:

– وا بەیانە، ئەمەندە تاریک نییە، تۆ ئەلفرێد موللەر ئەفەندی ناناسی؟ ئەلفرێد موللەر ئەفەندیی لەمەڕ میقائیللا. ها، میقائیللای شاتۆوەکە کە تەرپیری لێ بوو، کابرا واقی وڕ ما وتی:

– شاتۆ چییە، لێرە شاتۆ هەیە بەر ئەگرێ ئەما شاتۆ نازانین تۆ بەم سەر و سواڵکەرییەتەوە چۆن ئەبییە ئەفەندی؟

– چی بکەم پێرێ بتدیابە چە کوڕێ بووم ئەمشەو کە لە ژێرزەمیندا حەپسیان کردم و کە لە پەنجەرە خۆمم فڕێ دایە خوارێ لە خۆڵدا گەوزام و چاکەتم دڕا، وام لێ هات ئێستا تۆ هەرچلۆنێ بێ چارەی دەستێ جلم بۆ بکە ئینجا ئەمناسی.

– جارێ ئەم دێیە خەیاتی تیا نییە، باوجوود تۆیش پارەت نییە، ئەگەر پارەت ببێ من دەستێ جلت بۆ پەیدا ئەکەم.

– بۆ پارە پەکم ناکەوێ.

کە وتم پارەم هەیە، پێشم کەوت و چووینە ناو دێ، ئەمە خۆی بەکچیی[91] ئەودێیەیە و منی بردە ماڵی خۆیان، لە دەرگای دا، ژنەکەی دەرگای کردەوە، بە ژنەکەی گوت:

– بچۆ جلەکانم بێنە ئەیفرۆشم بەم پیاوە.

ژنەکەی چوو سەبەتەیێکی هێنا گونیەیێکی بەسەردا درابوو، هەڵی پچڕی، پانتۆڵێکی ڕەشی کورت، چاکەتێکی شینی ژاندرمەیی و مەنتانێکی[92] قاومیی، ژنە وتی:

– کەس جلی وای نەبووە ئەمە دە جەژنی دیوە، بەشی دەی تریش ئەکا، ئەگەر بە من بێ مێردەکەم نەیفرۆشێ چاکە، چونکە زۆری لێ دێ و پێوەی جوانە.

سەرتان نەئێشێنم ژنە بە زبانی لووس ئەو جلە کۆنانەی بە سەردا بڕیم، بە دوو لیرە و جلە تازەکانی خۆیشمی بدەمێ، هەی موبارەک نەبێ زاتەن

موبارەک نەبوو.

هاتم کیسەی پارەم دەرهێنا پارەیان بدەمێ، ژنەکە چاوی بە کیسە پارەکەوت زۆری تیایە، مرخی لێ خۆش کرد کەوتە سمتەلەقێ هات بە دەور و پشتما وتی:

– ماشائەڵڵا چەند کوڕێکی جوانی، ئەوە تۆ ژن وماڵت نییە؟ منیش فستانێکی جوانم هەیە پێت بفرۆشم،

وتم:

– خێر ژنم نییە، ڕێم لەبەرە، ژن ناهێنم.

هەرچەند بە دەورویشتما هات وتی:

– خوشکێکم هەیە بە قەدخۆم جوانە، ئەوەت ئەدەمێ.

وتم:

– کەس شک نابەم بە قەد تۆ جوان. ئەگەر ڕاست ئەکەی بە قەد تۆ جوانە، ئەو بە تەڕ و تازەیی بۆ مێردەکەت بێ، من بە ئاڵوگۆڕ ڕەزام.

پێ کەنی، وتی:

– بە خوا تەگبیری باش ئەزانی، زاتەن مێردەکەیشم لێم تێر بووە، بۆیە منداڵمان نابێ،

هەرچەند خەریک بوو بسازێ، بەڵام من داخی ئەو دوو لیرەیەم لە دڵابوو، بۆی دەرچووم. دیسان کەوتمەوە سەر جادە، هەندێ ڕۆییم لە دواوە ئەرابەیێکی پۆستە بە گرمگڕ هات لەگەڵ ئەرابەچیدا ڕێک کەوتم بە دە مارق تا هەرشوێنێ دەچێ سوارم کا، سوار بووم لە ڕێ ئەرابەچی لێم ئەپرسێ:

– بۆ کوێ دەچی؟

وتم:

– تا ویانە ئەچم.

قاه قاه دەستی کرد بە پێکەنین،

وتم:

– ئەوە دۆزیمەوە، تۆ مێردی سارینای، هێشتا وتەم لە دەم دەرنەهاتووە تۆ پێ دەکەنی.

وتی:

– ئەزانی ویانە چەندە دوورە، بە حەوت ڕۆژ نایگەیتێ،

ئیتر لە داخا سەرم نایەوە لەناو ئەرابەکەدا نووستم، سا نازانم چەند نووستووم، لە پڕ هەڵی ساندم وتی:

– دابەزە وا گەیشتینە دێ،

هەرچەند وتم:

– من بایی دە مارق سوار نەبووم.

– خێر (وتی) لەمە بەولاوە ناچم،

دای بەزاندم.

تێ فکریم، هەشت نۆ کچی جوانکەلە دەوریان دام وتیان:

– ئەفەندی، ئەمشەو میوانی ئێمە بە،

من وتم:

– چاکە،

ئەوان لەناو خۆیاندا کردیان بە شەڕ، ئەو ئەیگوت ئەمشەو لای من بێ، ئەویتر ئەیگوت خێر لای من بێ، کردیانە مقۆ مقۆ، من وتم:

– ئێوە نۆ کەسن، من نۆ شەو بەند ئەبم هەر شەوە لای یەکێکتان،

زۆر پێ کەنین. وتم:

– شەوی چەندم لێ ئەسێنن؟

وتیان:

– ئێمە هیچ پارە ناسێنین، مسافر پەروەرین، میوانمان لا عەزیزە.

وتم:

– ئەی لێرە پیاو ڕووت ناکەنەوە؟

وتیان:

– ئەوە نییە.

هەروا هاتن بە دەورو پشتما، پێ ئەکەنین، ئەویان دەیگوت بۆ من، لە پڕێکا پیاوێکی ڕیش سپی نوورانی پەیدا بوو کچەکان وەک جنۆکە "بیسمیللا"یان لێ دەکەن چۆن بڵاو دەبنەوە، وا ڕایان کرد. پیاوەکە پرسی:

– لە کوێوە دێیت؟ بۆ کوێ دەچی؟

وتم:

– بۆ ویانە دەچم، وتی بەو نزیکییە.

وتم:

– بۆچ دوورە؟

وتی:

– بە پێیان نایگەیتێ.

وتم:

– جارێ نۆ شەو لێرە دەبم ئەو نۆ کچە کە هاتی لە لام بوون، هەر یەکە بەڵێنی شەوێکیان لێ وەرگرتووم.

وتی:

– ڕۆڵە، ئەوانە هیچیان ماڵیان لێرە نییە، هاتوون بە ڕۆژ شەتڵە توتنیان پێ لێ ئەدەن، بە شەو لە دێبەردا ئەنوون و دەستەی سوورە خەتامەکەن.

ئینجا وتم:

– من ماندوو و مردوو و زۆریشم برسییە.

وتی:

– له دێدا جێیێک هەیە وەک ئوتێل وایە، خواردنیشی تیا دەست ئەکەوێ.

وتم:

– بە خێری خۆت بۆ نیشانم بدە.

ئیشارەتی جێگایێکی کرد، ئۆدە خانوویێکی وەک گەوڕی[93] ولاخ تەنها قاتێکی لە قوڕ دروست کراو، کە چوومە پێشەوە، دەرگایێکی بچووک، سێ تەنەکەی نەوت، تەختەیێکی درێژیان بە سەرا ڕایەڵ کراوە و هەندێ بەڵمە برنج[94] ڕاخراوە، ئەمە قەناپەی ماروکەنی لوکس[95] بوو دانیشتم و وچانم دا، هیچ کەس دیار نەبوو، هەتا تیاما بوو چڕیم:

– های لۆقنتەچی، های لۆقنتەچی ئەمەندەم شیڕاند خۆم گوێم ئەزرینگایەوە. لە پاش چەندێ لە کونێکەوە سەری زەلامێ دەرکەوت. کڵاوێکی سپیی شێتەکانی بیمارخانە لەسەردا بە تووڕەیی وتی:

– کورە چە شیڕ و هوڕێکتە؟

وتم:

– مردووت مرێ برسیمە.

وتی:

– مردووی خۆت مرێ، پیاوی برسی ئەمەندە نەعرەتەی ئەبێ؟

وتم:

– ئەی خۆ ئینشاڵڵا نابوورێمەوە.

وتی:

– سا کەواتە ڕاوەستە تا دێمەوە، ئەوسا ئیشتیهات ساف ئەبێ.

ڕۆیی و هاتنەوەی نەبوو، دانیشتم تاقەتم چوو، وەنەوزم ئەدا، ناچار هەڵسامە سەر پێ دەستم کرد بە پیاسە کردن تا لۆقنتەچیی ناموبارەک

پەیدا بوو، ئەوسا بە تەنها کەللەیم دیبوو بە سەر و سەکوتیا وەم زانی ئینسانە، ئیستا کە لەشی دەرکەوت هیچی لە ئینسان نەدەچوو، بە قەد باگردینێک شەڵوارێکی کورتی شین لە پێدا، بەروانکەیێکی چاوی نەشۆراو بە سنگەوە، چاوێکی پرووپووشاویی وەک کونی سووژن، لووتێکی کورتی سەر پانی پەڕەکەدار، لچێکی ئەستوور، ڕەنگێکی سوورفل[٩٦] وتی:

– ئینجا فەرموو چیت ئەوێ.

– چیم بوێ برسیمە.

– ئاخر چی ئەخۆی؟

– چیتان هەیە، لیستەکەتان بە چە زبانێ نووسراوە؟

– لیسەکەمان[٩٧] هەموو زبانێ فێری نەزان ئەکا.

– هەی ناموبارەک، لیس و تێلامان نیشان ئەدەی.

– ئەی من چوزانم لیسە چییە؟

– نازانی بە خوێندەوارێک ناوی چێشتەکانت بنووسە لیسە ئەوەیە.

– کاکە تۆ وا ئەزانی هیچ کارمان نییە لێرە قوتابخانەیێک دادەنێین فێری خوێندن بین و لیسا و لێس دەفتەری چێشت بۆ من بگرن، ئەمەندە مەڕێسە، چی ئەخۆی؟

– پرزۆلا.

– ئۆف ئۆف، بەخوا منیش ئەوەم دەست کەوێ بەشی کەسی لێ ناد...

– کەواتە مەشکەیێ دۆم بۆ بێنە.

– ئەفەندی من (ماستاو) فرۆش نیم، من هەم و مەنجەڵێ شۆربا و سەهد سەلک پەنیر، کامیان ئەخۆی بۆت بێنم؟

هیچ چارم نەما، وتم:

– شۆربا.

– لۆقنتەچی گوم بوو پاش قەدەرێک لە بنەکوولەکەی کەلا شۆربای هێنا، کەفی شین و مۆر بە سەرەوە، وتم:

– ئەوە چییە؟

– ئەوە شۆربای مێردانە.

– شۆربای مێردان چییە؟

– تۆ بیخۆ ئەیزانی، بەڵام ئاگات لە دەمت بێ نەسووتێ بە ئاگری توونی حەمام کولاوە.

– "ئۆف هێجگاری تامی تێ کرد" وتم:

– ئەمە چۆن ئەخورێ؟

وتی:

– ڕاوەستە پێ نیشانت[98] بدەم چۆن ئەخورێ.

چوو لە ژوورەوە کەفچەیێکی[99] چێشت تێکردنی هێنا و لە کوولەکەی شۆربای هەڵدا فوویێکی لێ کرد و کردییە دەمیەوە، مڵچەیێکی لێ هات و قووتی دا دەمێکی بۆ تەقاند و وتی:

– هیم هیم چە شۆربایێکی نازک و نازدارە.

کەوچکێکی تری هەڵگرت وتی:

– ئینجا فێری شۆربا خواردن بووی، با ئەم کەوچکەیشت لە بەر چاو بخۆم تەواو فێر بی.

تێ فکریم، هیچی تیا ناهێڵێ، ناچار وتم:

– ئەو کەوچکە بۆ من و کوولەکەی شۆرباکە بۆ تۆ. کەوچکی دایە دەستم و شۆربای ناو کوولەکەی نا بە سەرەوە، هەڵی قوڕاند و هەڵی چوڕاند[100].

پرسیم هێلکە لێرە دەست ئەکەوێ، وتی کە پارە بوو مادامی منیش دەست ئەکەوێ، ها چاک بوو هێلکەت هاتەوە بیر، ژنەکەی من مەشهوورە،

هێلکە و ڕۆنی چاک ئەکا. با پێی بڵێم هێلکە و ڕۆنێکت بۆ بکا قامکی خۆتی پێوە بخۆی، وتم:

– دەخیل ئەوەم لەگەڵ مەکە من بە پەنجە و بە قامک کەمان لێ ئەدەم، ئەگەر قامکی خۆم بخۆم بە چی کەمان بۆ خانمەکەم لێ دەم؟

سەرتان نە ئێشێنم پاش نیو سەعات خۆی و ژنەکەی هاتن پارچە تەنەکەیێکیان چاڵ کردووە، دوو هێلکەیان شکاندووەتە ناو ئاوەوە، ئەمەندەیان کوڵاندووە، بووە بە بەردی ڕەق، تەنەکە دیتە ژەنگاوی بووە، هەموو ژەنگەکەی داوەتەوە هێلکەکەی سەوز کردووە وەک پینە کەوش لەناو تەغاراوی[101] پینەچیدا ڕەش هەڵگەڕاوە، هەر پووش و پەڵاشی ناویانە، بە ئاگرەکەوە سووتەمەرووکەی[102] کەوتووەتە سەرهێلکەکە. ئەوە هێلکە و ڕۆن، ئافرەتەکەیش خۆیشی عەینەن ورچەکەی مندوڵ،[103] کوڵە بنەیێکی مل لە سینگ دەراتوو، هەموو دەموچاوی بە سپیاو سواغ دراو، دوو چاوی وەک کونە سووژن بە قووڵاچوو بڕ لە کل، دەمێکی پانی سواڵەتی تەنها دوو ددانی بێڵەکانی[104] لە پووکی سەرەوە سەری بۆ بەر لووت هەڵگەڕاوەوە، دەمیشی ئەوەندە چاڵە وەک قەڵتاخی[105] زین چەناگە بۆ لای لووت هەڵکشاوە، دیتە دووکەڵی پووش و پەڵاش چووە بە چاویا کلەکەی تواوەتەوە و بە سەر ئەو ڕوومەتە جوانەوە ڕێ ڕێ هاتووەتە خوارێ، وەک پۆپەشمینی[106] میل میل جێی دڵۆپەی کلەکەی دیارە، ڕۆیینێکی وەک بێشکەی شکاو، یاخو وەک واپۆڕێکی لەناو شەپۆلی دەریادا (یاڵپا) ئەم دیوە و دیو بکا بە ترپە ترپ هاتە بەردەمم، وتی:

– چۆنە هێلکە و ڕۆنەکەت؟ ئەوە بەم دەستە نازک و نازدارە بۆم دروست کردووی.

هات دەستیم پێ نیشان بدا وتی:

– پێ و پووزیشم هەر جوانە و لە هێلکە و ڕۆن بە لەزەتترە.

وا کابرای مێردیشی ڕاوەستاوە، وتم:

– ڕاست ئەکا ئەوەندە بە لەزەتە؟

وتی:

– هێلکە و ڕۆنەکە بخۆ تێ دەگەی.

– دیار بوو بە ئاشکرا نەیدەوێرا دەردی بێتامی بەیان کا و ئەیشیزانی هێلکە و ڕۆنەکە ناخورێ، ناچار لە برسانا هاتم پووش و پەلاشم لەسەر هێلکە لادا و هەندێکم بە نانێکی ڕەشی چەودارەوە[107] خوارد مادامیش هەر مەدحی هێلکە و ڕۆنی ئەکرد، کە چەند بە لەزەتە مەقسەدیش خۆی بوو وتی:

– با لێرە ژنێکت بۆ بێنم.

هەر ئەوەندە لەدەمم ترازا وتم:

– دەسا دەی بتبینم.

– وتی کچێکی زۆر شیرین و جوان بە قەد خۆم جوانە، ئەما نەختێ لە من کورتترە، ناوی (مارغۆ)یە. حازر ئەمشەو بۆت دێنم، ڕاوەستێ هەر ئێستا بانگی کەمە ئێرە.

– هەر لە خۆیەوە هەلسا و وەک تەشیلە[26] خل بووەوە و ئەوەندەی هێلکە و ڕۆنەکەی پێ نەچوو یەکێکی لە خۆی کولەبنەتری هێنا، من دانیشتم و ئەو بە پێوە، هێشتا من کەلەکەتر بووم. کەوتینە کالتە، من مەقسەدم ئەوە بوو ئەو شەوە نەختێ بە کالتە ڕابوێرم، زاتەن بەیانی زوو شانم پیا دەکرد، ئەوان بە ڕاستیان بوو وتیان وا بڕایەوە. هەر بەو شەوە هەموو ئاواییان دەنگ دا کە بەیانی بێنە زیافەتی نیکاح و خەبەریشیان دابوو بە ڕاهیب، سبەینێ زوو حازر بێ، منیش وتم:

– باشە، بەلام جارێ زۆر ماندووم، خەوم دێ، لێم گەڕێن با نەختێ بنووم.

– کچە وتی:

– حەو، من ئەمشەو لە خۆشییانا نانووم، تۆ هەر وا زوو ئەنووی.

– بە هەزار ئاین و ئۆین ئەوانم لە خۆم دوور خستەوە، منیش هیچ خۆم رووت نەکردەوە، وتم نەک سبەینێ تا من خۆم کۆ دەکەمەوە بێنە سەرم، هەروا لێی ڕاکشام.

– سا کاری تاڵعی ناسازم بەیانی وەختێ خەبەرم بووەوە، چواردەورم بە ژن و پیاو و پاپاس گیراوە.

– شاییکەر کچەیان کردە سەرم هەڵیان سەندم،[108] پاپاس هاتووە مارە دەبڕێ، ئەوەندەم پێ کرا وتم:

– ڕاوەستن تا دەموچاوم ئەشۆم.

– وتیان:

– مەسینە و لەگەنت بۆ دێنین.

– وتم:

– ئاخر ئیشی سەراوم هەیە.

– بە هەزار حاڵ خۆم گەیاندە دەرەوە، دیسان سەرم ئەخورا، بانگم کرد:

– دەستگیران بە دوعا... و

ڕام کرد، هەر ئەوەندەم زانی ژن و پیاو، گەورە و بچووک شوێنم کەوتن، هەردوو کوڵەبنە، یەعنی ژنە ئوتێلچی و دەستگیرانیش بە خلەخل بە دواما بە خوا لە پێشدا وەک تیر لە کەوان دەرچێ ڕام کرد و تێ پەڕیم، بەڵام کوڕەلادێیی لەمن بەلانتر بوون[109] تەنگیان پێ هەڵچنیم و لەو وەقتەیشدا جۆگە ئاوێکم هاتە ڕێ، هاتم لێی بپەڕمەوە تێ فکریم زۆر قووڵە و لە دوایشەوە دوو کوڕی بە کێشیان نزیک بووبوونەوە، ناچار لەناو ئاوەکەدا خۆم کوتایە بن (پەرچ)ێک، تەنها سەرم بەدەرەوە بوو، شەپقەکەیشم ئاو بردی، ئەو دوو کوڕە ئاخری دۆزیمیانەوە و گرتمیان وتیان هەر دەتکوژین، یا پارەی ساڵێکی کاسبیی خۆمانمان بدەرێ، یا تەسلیمی خەڵکی دێت دەکەین

سەنگەسارت[110] بکەن، وتم:

– بابە بمپەڕێننەوە "ئەلحوکمولیللا" شەش لیرەتان ئەدەمێ، "ئاخر پارە بۆیە چاکە". پەڕاندمیانەوە و پارەکەم دانێ، بەریان دام، سا قەدەرێ ڕۆییم، ترسی شوێنکەوتووانم نەما لە کەناری ڕێ لێی دانیشتم، تێ فکریم ڕێبوارێ پەیدا بوو، هەر وەکو ئەو ڕۆژە من چۆن لە مالّی باوکم هاتبوومە دەرێ بە جلە شڕەکانمەوە توورەکەی کەمانەکەم کردبووە ملم ئەویش بەو ڕەنگە بەڕێدا ئەهات، لەگەلّ چاوم بە کەمان کەوت لە خۆشیانا کەوتمە سەما چووم دەستم کردە ملی هەی بە خێر بێی. کابرا وەی زانی من شێتم لەوە ئەترسا کەمانەکەی بشکێنم، وتی:

– ئامان چی دەکەی؟

– وتم:

– کەمان لێ ئەدەم.

– هەر لەوێ دانیشتم کەمانم لە توورەکە هێنایە دەرەوە، ماچێکم کرد و دەستم کرد بەو مەقامی هیجرانییە کە بۆ خانمەکەم لێ دابوو، هەر ئەوەندەم زانی کابرا ئاوازەیێکی بەرزکردەوە، دەنگ و سەدایەک دار و بەردی ئەهێنایە جۆش، هیچ ئافەریدەیەک ئەو دەنگە خۆشەی نەبوو، بیری ڕۆژەکەی ناو بێشەکەم کردەوە، کە خانمەکەم بە کەمانەکەی من گریا، منیش بە دەنگی ئەم کوڕە زۆر زۆر گریام کە لێ بووینەوە پرسیم:

– براکە: کێی؟ ناوت چییە؟ بۆ کوێ دەچی.

– فرەدریک شوللەر، ئەلّمانم، بۆ سیاحەت ئەگەڕێم.

– ئۆخ بە خوا چاک ڕێک کەوتووە، فرەدریک شوللەر. منیش ئەلفرێد موللەر، تۆ خاوەندی ئەو دەنگە، من ئوستادی ئەم کەمانە بین، گەنجی دنیا هی ئێمەیە.

من هیچم پێ نەبوو بیخۆم، بەلاّم ئەو هەندێ پاسدیرمە و نانی پێ بوو،

خواردمان و روومان کرده قاپیی خوا و کەوتینە ڕێ. دەمی ئێوارە، ڕێمان کەوتە شارێکی گەورە، هیچمان نە ئەزانی کوێیە. پرسیمان وتیان، ئەمە شاری "مونیخە"، کاری ڕاست بێ ڕاهیبەکەمان دەرسی جوگرافیای پێ گوتبووم، دەمزانی لە ئەڵمانیا شاری مونیخ[111] هەیە. کە هاتینە ناو شارەوە گەیشتینە بەردەگایێکی گەورە دوو خواجەنشینی[112] بوو، بە فریدریکم گوت:

– تۆ لەوبەر دانیشە، من لەمبەر ئاهەنگێ بکەین.

ئێمە دەستمان بە کەمان و گۆرانی کرد، لە سەرەوە هەرچی پەنجەرەیان بوو هەمووی کرایەوە، ئافرەتی جوان جوان و پیرەمێردێکی نوورانی سەریان لە پەنجەرە هێنایە دەرێ، تێر گوێیان لێ گرتین، کە لێ بووینەوە، ئەمەندەیان پارە بۆ فڕێ داینە خوارەوە، تەپڵەکەی[113] فریدریک پڕ بوو، پیرەمێرد ئەوەیشی بە کەم زانی، ڕیاڵێکی زیوی ئەڵمانی، کە بیست مارقی بوو، بۆی هاویشتە خوارێ، ئەمانەمان کۆ کردەوە، فریدریک وتی:

– تۆ هەڵی گرە با پارە لای تۆ بێ.

منیش کردمە دەستەسڕێکەوە، ئەختێکی تر ڕۆیشتین، ماڵێکی گەورەتر تووشی هاتین لەوێش دەستمان کرد بە ئاهەنگ لەوە زیاتریش پارەیان داینێ، تێ گەیشتین کە خەڵکی موونیخ ئەهلی زەوقن. لەو وەقتەدا پیاوێ هات وتی:

– وەرن بتانبەمە ماڵێک، لەوێ گۆرانی بڵێن، زۆرتان ئەدەنێ، پێشمان کەوت بردینییە قۆناغێک[114] بە قەد سەرایێک بوو. هەر وا بە باغچە و دیواخاندا سەری خستین تا گەیشتینە دائیرەی حەرەم، لە سالۆنێکی گەورەدا دایان ناین، وردە وردە ئەهلی ماڵەکە گردبوونەوە، پیاوێکی زۆر کیبار بە خێر هاتن و ماندوو نەبوونی کردین و ناوی پرسین و لە پاشا وتی:

– برسیتان نییە؟

من تەمام بوو بڵێم برسیمانە، فرەدریک ئانیشکێکی تێوە ژەندم تێ

گەیشتم، وتم:

- خێر تێرین.

- وتی: وا ئێوارەیە، ئێستا هیچ مەخۆن، ئێوارە ئیشتیهاتان ببێ.

بەوە تێ گەیشتم کە ئێوارە گلمان ئەداتەوە. هەر وا وەختمان ڕابوارد ئێوارە ساڵۆنەکە پڕ بوو لە میوان. ئافرەت هەر یەکە چوونە ژوورێکەوە، خۆیان ڕووت ئەکردەوە، جلی بالویان لەبەر ئەکرد و ئەهاتنە "شەواهەنگ" بالو، دوایی کچێکی پیانیست چووە بەر پیانۆکە، بە منیشیان گوت:

- هەڵسە تۆش بچۆرە تەنیشت ئەوەوە تۆیش بە کەمان ئاهەنگی لەگەڵ بکە.

ئەو ساڵۆنە ڕەوغەنی جەلایان[115] لە فەرشەکە دابوو، تەنها بۆ ڕێبازێکی باریک سەرەنازی[116] تەسکیان ڕاخستبوو، قۆندەرەکەم ئەمەندە قوڕاوی بوو ڕووم نەهات بەو قۆندەرەیەوە بەسەر ئەو فەرشانەدا بڕۆم لە لاڕێکە پێم لە سەر تەختە ڕەوغەنداره لووسەکە دانا بە جارێ هەڵخلیسکام، مێزێک لەبەردەمما بوو ئەنواعی پیاڵە و قاپ و شووشەی لەسەر بوو، قلپم کردەوە هەموو تێک شکا و بەکنگەخلیسکە گەیمە بەر ئەسکەملەی کچە پیانیستەکە، پێم بە پێچکەی ئەسکەملەکەی ئەو گرتەوە، ئەسکەمل وەرگەڕا مادموازێل شلپ بە سەرما کەوت، قۆڵی ڕووت و نەرمۆڵە، منیش بە گازی پشتا ڕاکشابووم، لەپەڕوو تێم چەسپی، هەڵکەوتێکی باش بوو، بەڵام من تەتەڵەی... م شکابوو، جووتکەم ژانی ئەکرد، حاڵی ئەوەم نەبوو لەزەتی لێ ببینم، هەندێ پێمان پێ کەنین، هەندێ بەزەییان پیامانا هات. فرەدریک فریام کەوت، کچەی لەسەر هەڵساندم، منی ڕاست کردەوە، بەڵام حاڵم نەما بوو، غیرەتم دایە بەر خۆم، بەوەی چاک بوو تەرپیری خۆم سارینا لەوێ نەبوو تەریقم بکاتەوە، خاوەند ماڵ بە تەڵاشەوە پرسی:

- هیچ کوێت نەشکاوە؟

وتم:

- کاشکی ملم بشکایە و ئەوەندە خەسارەم نەدایێ.

وتی:

- تۆ خۆش بی قەیدی ناکا.

چارەک سەعاتی شەو ئاهەنگیان پەک خست تا ژانی جووتکەم شکا و کچە پیانیستەکە چووەوە سەر پیانۆ، منیش بە، بەلەم بەستم چوومە لایەوە و کەمانێکی وام لێ دا، تۆڵەی خەسارەیەکەم کردەوە فرەدریکیش بەرخوردار بێ، ئەمەندە جوانی خۆند، خەمی لە دلّی کەسدا نەهێشت، ئینجا وچانێکمان گرت، دەستمان کرد بە شامپانیا خواردنەوە، هەر من ئەمخواردەوە و فرەدریکم لێ توورە ئەبوو، فائیدەی نەبوو، تا دەبەنگ بووم، هۆشم بەخۆم نەما بوو، هەڵسام نوتقێکم[117]دا، ورد و درشت پێکەنین، ئینجا کەوتنە دانس، جووتە جووتە ژن و پیاو پێکەوە هەڵدەپەڕین، من کەسم بۆ نەمابووەوە، کچێک لەبەردەرگا وەستا بوو، لە پێش چاوم جوانی نواند، ڕام کرد چوومە بەردەمی (رەوەرانس)ێکم بۆ کرد، کڕنۆشم بۆ کێشا، وتم:

- وەرە من و تۆیش دانس بکەین.

کچە دایە قاقای پێکەنین و ڕای کرد، چوومە بەردەمی خاوەند ماڵەکە، وتم:

- بۆچ من بە پیاو نازانن لەگەڵم هەڵناپەڕن؟

وتی:

- ئەوەی تۆ چوویتە لای کارەکەرە، بۆ ئەو ناشێ لە سالۆنی ئێمەدا دانس بکا.

وتم:

- سا کەواتە خانمێکم بدەرێ.

پێ کەنی وتی:

- ئەمانە بەمن نابەخشرێن، ئەبێ خۆیان ڕەزا بن.

خانمەکان کە گوێیان لەم گفتوگۆی من و ئاغا بوو دەستیان بەردا. بە پێکەنینەوە لێم کۆبوونەوە، ئەویان ئەیگوت فەرموو لەگەڵ من، ئەویتریان ئەیگوت بۆ من، نیهایەت لەناو خۆیاندا چوار شۆڕەژنی بە گوڕ و زۆرداریان هەڵبژارد، چوارپەلیان گرتم مەشکەژەنییان پێ کردم، خێرجۆشم نەدەنیشتەوە تا فرەدریک قۆڵی گرتم لە سالۆنەکە بردمیە دەرەوە ئۆدەیێکیان نیشان داین، کچێکی خزمەتچی لەگەڵمان هات جێگای بۆ ڕاخستین، بە سەرخۆشییەوە دەستم کردە ملی وتی:

- چی ئەکەی؟

وتم:

- ئەی ئاغا پێی نەوتی؟

وتی:

- هەی ناموبارەک.

سیخورمەیێکی لێ دام، ئەوەندە سەرخۆش بووم کەوتم، خۆیشی ڕای کرد، ئینجا فرەدریک لێم تووڕە بوو وتی:

- ئێستا خاوەند ماڵ بزانێ تۆ وا ئەکەی دەرمان ئەکا.

وتم:

- جا با دەرمان کا، پارەی زۆرمان پێیە ئەچینە ئوتێل.

بە هەر حاڵێ بوو فرەدریک دای مرکاندم، خۆم ڕووت کردەوە بنووم، ئەمەندە شامپانیام خواردبووەوە ئیشی سەراوم زۆر بوو، هاتمە دەرێ بچمە ئابدەستخانە، ڕێگام نەدەزانی، هاتمە دەرێ بەڵکو یەکێ ببینم ڕێی ئابدەستخانەی لێ پرسم، کەس نەبوو، میزیش تاوی دام وام زانی شاتۆکەیە

قاپیی سیم ئابدەستخانە بوو، دەستم کوتا بە بەلەکۆنی دوو دەرگام ژمارد سەری سێیە دەرگا، کردمەوە پێم نایە ژووریّ لە یەکێ هەڵئەنگوتم، ڕاست بوومەوە و هاواری کرد دزە، های دزە، گەڕامەوە ڕام کرد بۆ ژوورەکەی خۆمان بە پەلە پەل خۆم کوتایە ژوورەوە هاتم خۆم بکەم بەژێر لێفەوە ئافرەتێکی تیابوو ڕاپەڕی هاواری کرد:

– ئەمەتە، ئەمەتە، قوربانتان بم دەری نەکەن، دزە هاتە ژوورەکەی من.

تومەز غەڵەتە، هاتوومە ژووری ئافرەتێک، بە ژووری خۆمانم زانیوە، بە هاواری ژنە خەڵک ڕوویان کردە ژوورەکە، منیش هیچ چارم نەما دەرگام خڕ داخست لە دەرەوە خەریک بوون دەرگا بشکێنن، ناچار پەنجەرەم هەڵدایەوە، بێ ئەمەی بزانم بەرزە یا نزمە لە پەنجەرەوە خۆم هەڵدایە خوارەوە، سا تا من ئەمەم کرد ئەوان دەرگایان شکاند، هاتبوونە ژوورەوە، زانییان من خۆم لە پەنجەرەوە فڕێ داوەتە خوارەوە بانگیان کردە باغچەوان (پاوڵ) دزە، دەری مەکە، باغچەوان بە خۆی و تێلایەکەوە و کەماڵێکی زلەوە پەلاماریان دام، ڕام کرد، درەختێکی گەورەم هاتە پێش، خۆم هەڵدا سەرکەوم،سەگەکە لە دواوە دەرەلنگی دەرپێکەی گرتم بچڕی، بە هەر حاڵێ بوو چوومە سەر درەخت، پاوڵ قۆندەرەی داکەند، بە شوێنما سەر دار کەوێ، تێ فکریم لقی دارەکە بەسەر کۆلاندا شۆڕ بووەتەوە، چوومە سەر ئەو لقە و خۆم داهێشتە خوارێ بۆ کۆڵان، خوا و ڕاستان ئەم جارە کەوتمە سەر کۆمەڵە پەین، کە بۆ باغیان هێنابوو، ئازارم نەگەیشت، هەڵسام و ڕام کرد، باغچەوان و سەگ بە شوێنما خەریک بوون دەرگای باغچە بکەنەوە، من لە وزەی ئەوان دەرچووبووم، بە درێژاییی کۆڵان ڕام کرد، لە سەری کۆڵان کتوپڕ بەرانگاری بەکچی هاتم، چەتەوڵێک[118] توند قۆڵی گرتم، وتی:

– ئۆخەی بەرگیرم کەوتی، دوێ شەویش هاتبوویتە سەر ماڵی (میلار) دزی بکەی.

هەرچەند وتم باوکم پیاوی چاک بە ئەزیەتم مەدە، بە خوا دز نیم، فائیدەی نەبوو، زۆر زل و بە قووەت بوو، لەبەر ئەوە منی بە هیچ نەدەزانی، قۆڵی شل گرتبووم، فرسەتم لێ زانی، قۆڵم ڕاتەکاند، مستەکۆڵەیێکم دا لەسەر سنگی بە پشتا کەوت، دیسان ڕام کرد، بەڵام هیچ هێزم تیا نەما بوو، کابرایش هەڵسایەوە و فیقەیێکی لێ دا چوار ژاندرمەی قۆڵ ڕایان کرد، چوونە لای کابرا وتیان:

– چی بوو؟

وتی:

– دزێکم گرت، ئەهمییەتم نەدایێ لە دەستم ڕای کرد.

منیش لەو وەقتەدا دەرگاییێکم هاتە پێش، دەستم پێوە نا کرایەوە، چوومە ژوورەوە دەرگام داخست و لە کەناری دەرگا ڕاوەستام، هەر ئەوەندەم زانی ژاندارمەکان هاتنە بەردەرگا ڕاوەستان، دوانیان وتیان ئێوە ڕاکەن سەری ئەو کۆڵانەکەی تر بگرن وا ئێمە لێرە دادەنیشین بزانین لە کوێوە سەر هەڵئەدا؟ دە یا ڕەببی من چی بکەم؟ وا ئەمانە لەبەردەرگا دامەزران چار چییە؟ لەو وەقتەیشدا ترپەی پێی زەلامێک هات وتیان ئاها ئەوە، ڕایان کرد، ئەبینن سەرخۆشێکە بەلادا دێ، کە سەرخۆش ژاندرمەی دی بانگی کرد:

– کورە ئێوە کێن وا بەردەرگاتان بەمن گرتووە؟

– ژاندرمەکان ناسییان، وتیان:

– وای (ڕینکەر) تۆی؟

وتی:

– بەڵێ وا من منم، ئێوە کێن؟ لەبەردەگای من هەڵوەستاون.

کە ڕینکەر وای گوت، هێجگاری وەرەم بەردا، ئەیواە[119] ئێرە ماڵی ڕینکەرە، ئێستا دەرگا ئەکاتەوە و دێنە ژوورەوە، جا چی بکەم؟

وتیان:

– تا بەردەکای تۆمان ڕاوناوە، ڕەنگە خۆی کوتابێتە ماڵی ئێوە.

وتی:

– سـا دەخیل بەجێم مـەهێڵن، لەگـەڵم وەرن مـاڵەکە بگەڕێن هێـجگاری ڕووحم چوو.

بەڵام ژاندرمەکان وتیان:

– تۆ بچۆرە ژوورەوە وا ئێمە لێرە ئەبین، مەترسە.

دەستی نا بە دەرگاوە داخرابوو، وتی:

– حای، من هیچ شەوێ دەرگام دانەخستووە، کەچی وا ئەمشەو دەرگاکەم داخراوە.

کلیلی دەرهێنا دەرگا بکاتەوە، من چارم نەما، چووم بەرەوژوور بە تاریکی و پەلەکوتێ قاڵدیرمـەم دۆزییـەوە سەرکـەوتم، ئەویش دەرگای کردەوە هات لە پێپیلکانە سـەرکەوت، من دەستم کوتا دەرگـایێکم دۆزییەوە چوومە ژوورەوە و دەرگام داخست. تومـەز ئەمـە ئابدەسـتـخـانـەیە، ڕینکەر جـارێ ڕاست ڕووی کردە ئابدەستخانە بێتە سەراو، دەرگای ئەوێش داخرابوو. وتی:

– سوبحانەڵڵا ئەمشەو هەموو دەرگام لێ داخراوە.

وام زانی دەرگای ئابدەستخانەکە ئەشکێنێ و دێتە ژوورەوە، کەچی وتی:

– قـەید ناکـا جارێ بـا جێگایێکم دەست کـەوێ هەندێ ڕاکشـێم، دوایی دێمە سەراو.

وەرگەڕایەوە، زرمـەها کەوت، قـەدەرێ بۆڵاندی، کە هەسـتـایەوە ڕووی کردە دەرگـایێکی تر، ئەویش داخرا بوو، ئینجـا هێجگاری سـوخت بوو[١٢٠] دەرگای دایە بەر لەقە، دەنگی ئافرەتێک هات وتی:

– وۆحە وۆحە کاشێت، ئەو دەرگایە بۆچ ئەشکێنی؟ پارەت زۆرە؟

– وتی:

– (پاردۆن)[١٢١] خورشیدە نازدارەکەم ئەمشەو سەعاتم لەگەڵ خۆم نەبردبوو بۆیە درەنگ هاتمەوە، لەعنەتنامەم بێ، بێ سەعات ئیتر نەچمە دەرەوە.

ئەم پاڕایەوە و ئەو جنێوی دا، بە هەزار کەشمەکەش دەرگای لێ کردەوە، منیش دڵم تەسەللای هات، دەرگای ئابدەستخانەم کردەوە هاتمە دەرێ، لەبەردەرگاکە قوتوویێ کبریت کەوتبوو هەڵم گرت، هاتمە بەر قاپیی دەرێ، خۆم گرت هێشتا ژاندرمەکان لە بەردەرگا دانیشتبوون، هاتم بە حەوشەکەدا گەڕام وتم بەڵکو باغچەیان ببێ لە پشتەوە دەربازبم، تووشی ئۆدەی مەتبەخیان هاتم، چوومە ژوورێ کبریتم لێ دا مۆمێکم دۆزییەوە دام گیرساند، گەڕام خواردەمەنیی هیچ تیا نەبوو، سەبەتەیێک جلی چڵکنی تیا بوو، ڕوانیم بەڵکو چشتێکی وای تیا بێ لەبەری کەم، هەموو کراسی دەقۆڵتەی[١٢٢] دانتەلەداری ژنانە، کەڵکی منیان نەدەگرت، لە ژێرەوە چاکەت و پانتۆڵێکی کۆنی پیسی لە نەوت و بۆیا هەڵکێشراوی تیابوو، زانیم ئەمە جای بۆیاچییە، چار ناچار لەبەرم کرد، مایە سەر شەبقە و قۆندەرە. شەبقەیێکی کۆنی جاویشم دۆزییەوە، قۆندەرە کۆنیان زۆر بوو، مەزننە کۆیان کردبووەوە بیفرۆشن، گەڕام جووتێکیان بە پێمەوە چوو، کردمە پێم، هاتمە دەرێ چراکەم نەکوژاندبووەوە، لە پشتەوە باغچەیێکیان بوو، دیواری نزم بوو، بازم دایە کۆڵان، جا، چشتێکی تر زەحمەت بوو، من لە کۆڵانی بەرەوە هاتبووم، ئێستا کەوتوومە کۆڵانی پشتەوە، ڕێگای قۆناغی (یۆهان)م نە ئەدۆزییەوە، یەعنی ئەو ماڵە، کە شەو لەوێ ڕام کردبوو و فرەدریکی لێ مابووەوە نەمئەناسی. هەروا هاتم بەڕێدا شەویش ئەوەندەی نەمابوو تووشی بیراخانەیێک بووم چرای ئەسووتا و کەسی تیا نەبوو، تەنها زەلامێک لەسەر قەنەپەیێک ڕاکشا بوو، بەو بەرییەوە ڕاکشام، ئەمەندە هیلاک بووم خەوم لێ کەوتبوو، کاتێ خەبەرم بووەوە کابرای بیراخانەچی لەگەنێ[١٢٣] ئاوی پیا کردبووم شڵپەم ئەهات، قەدەرێکم جنێو پێ دا پێ کەنی، ناچار هەڵسام

بەیان بوو، بە پرسیار ماڵم دۆزییەوە، لە سەر خواجەنشینی بەردەرگاکەیان دانیشتم، رووم نەدەهات لە دەرگا بدەم، سەرمایش لە هەموو بەدەنی کار کردبووم، وەک کەروێشک هەزارەم دەکرد، گەیمە بەر پەنجەرەی ماڵێک پەنجەرە کرایەوە، لە سەردا پڕ قاعەدەیێک[١٢٤] پیسایی منداڵم بەسەردا کرا.

ئینجا بەم حاڵەوە و بەم بەرگەوە چی بکەم؟

خۆم راوەشاند و تەکاند، گەڕامەوە لای ماڵەکەی تیا بووین، تێ فکریم لە باغچەکەدا فرەدریک ئەگەڕێ، تومەز هاتووە بزانێ شەو من لە کوێوە رام کردووە؟ کە چاوم پێ کەوت بانگم کرد. نەیناسیمەوە، بە هەزار حاڵ تا وتم:

– کورە ئەلفرێد.

وتی:

– خوا بتگرێ، ئەم قیافەتە چییە؟

وتم:

– مەپرسە.

ئیتر هات دەرگای لێ کردمەوە، ئەوان هێشتا نووستبوون بردمیە ئۆدەکەی خۆمان، بۆ گەنم لێ دەهات، وتی:

– گورج جلەکانت داکەنە.

وتم:

– ئەوە جلی ماڵی کابرای سەرخۆشە، بێخەبەر هانیومە، دەبێ بۆیان بەرمەوە.

وتی:

– مردووت مرێ، جارێ وەختی ئەوە نییە، زوو خۆت رووتەوە کە.

هەچیم لەبەردا بوو دام کەن، بەڵام فانێلە و کراسەکەیشم تەڕ بوو، هیچ نەبوو لەبەری کەم، دەرگا کرایەوە کچە خزمەتچییەکە، کە شەوێ دەستم

کردبووە ملی بە پێکەنینەوە هاتە ژووریّ، وتی:

– دەستگیران بەخێر بێیتەوە چاوم لێت بوو بە جلی زاوایتەوە هاتییە ژووریّ، بەو جلانەوە بۆ نەهاتی دەستیّ بکەیتە ملم؟

نەختێ تەریق بوومەوە، چوو کراسێکی دانتێلەداری ژنانەی خۆی بۆ هێنام بەرویشت لەبەرم کرد و ڕاکشام تا هەموویان خەبەریان بووەوە. خاوەند ماڵ ناردی بە شوێنما، من بە خەجاڵەتی چووم دوعاخوازیم لیّ کرد، وتم:

– ئەڕۆم.

هەرچەند لەگەڵم خەریک بوون بەند ببم، بەند نەبووم، بەخششێکی زۆریان داینیّ و هاتین ملی ڕێمان گرت تا گەیشتینەوە ویانە.

*

موتەرجیم ئەڵیّ: کتێبەکە زۆر بوو، ناچار لێمان کورت کردەوە. زۆرتری لەم ماڵی شەوناهەنگەدا پەت پەتی زۆرتری بەسەر هاتبوو، لەوێوە هەڵمان گرت بە قاڵیچەی حەزرەتی سولەیمان گەیاندمانە (ویانە).

*

## بەشی چوارەم

### شاری ڤیانە

کە گەیشتینە شاری ڤیانە، بە فرەدریکم گوت:

– برادەر، وا ئێمە گەیشتینە ئێرە، من هەر ئەمەندەم بەس بوو، هەرچی پارەیێکمان هەیە هەمووی بۆ تۆ و کەمانەکەیشت بۆ خۆت، من خانمەکەم ئەدۆزمەوە،

– وتی:

– برادەر، ئەمیش مەکە بە ماڵی کابرای مونیخی، ڕاوەستە تۆ هەروا بە سەهلی ماڵی خانمەکەت نادۆزیتەوە، پارەت پێ نەبێ سەرگەردان ئەبی، جارێ با پێکەوە بین تا جێگیر ئەبی، ئەوسا بۆ منیش خوا کەریمە.

ئینجا بە جادەدا ئەڕۆیشتین، هەروا خەڵک پێمان پێ ئەکەنین، تووەز ئەو قیافەت و جلوبەرگەی ئێمەیە لەناو ئەواندا عەیب بوو، هەر ئەوەندەمان زانی یەکێ بانگی کردین:

– کورە ڕاوەستن.

– ناچار ڕاوەستاین، هاتە پێشەوە پرسی:

– ناوتان چییە؟

من وتم:

– چیت لە ناوی ئێمە داوە،

شانی ڕاتەکاندم وتی:

– ئێستا تێت ئەگەیێنم کە بۆچی ناوت ئەپرسم؟

– تومەز ئەمە پۆلیسە.

وتم:

– من ناوم ئەلفرێد موللەر، هاورێکەیشم فرەدریک شوللەر.

– لە کوێوە دێن؟

– نازانم، چونزانم شاتۆی خانمەکەم لە چە شارێکە.

– کە وا بێ ئێوە خەڵکی ئاوستریا[125] نین.

– خێر.

– کەوا بوو پەساپۆرتتان کوا؟

– جارێ تێم بگەیێنە پەساپۆرت چییە؟ چونکو ناوی نازانم.

وتی:

– کەواتە پێشم کەون.

بردینییە قاپییێکی گەورە، خۆی شەبقەی داگرت، چووە ژوورەوە، ئێمەیان بانگ کرد، شەبقەمان دانەگرتبوو، شەبقەکەیان فڕێ داین و داوای پەساپۆرتیان کرد، نەمانبوو، حەپسیان کردین و پارەکەیشیان لە باخەڵ دەرهێناین، وتیان:

– دزیوتانە.

هەردووکمانیان کردە ئۆدەیێکەوە و کز و مات ڕاکشابووین، خەومان لێ کەوتبوو، لە پڕ یەکێ هاتە ژوورەوە، پێییێکیان پیا ناین. کە خەبەرم بووەوە وتم:

– تۆ کێی؟

وامزانی پۆلیسە، پۆقڵەمەمان[126] ئەکا، کە تێ فکریم، سورفلێکی چاوشین، وتم هەبێ و نەبێ ئەمە ئینگلیزە، کەچی مرمیێکی لێوە هات، وتی:

- (یێس یێس).

بیستبووم به ئینگلیزی (بەڵێ)یە. ئیتر نەمئەزانی ئەڵێ چی؟ فرەدریکم هەڵساند، کابرا زۆر سەرخۆش بوو، بەلادا ئەهات، وتمان با نەکەوێ بەسەرمانا، پەلمان گرت دامان نا، دەستی کردە جنێو (یوو، ئار ئەن ئەس) ئەمزانی جنێوە بەڵام نەمئەزانی بەر خۆم ئەکەوێ یا باوک و دایکم، ئێمە هەر پێ ئەکەنین، کابرایش هەر جنێوی ئەدا، زانی بە زبان تێ ناگەین، ئینجا بەدەست و ئیشارە بۆی تەرجەمە ئەکردین، هەر دوو دەستی لە راستی سەری ئەکرد بە دوو گوێچکە وەک گوێدرێژ و (عا، عا) ئەزەڕی، یەعنی ئێوە کەرن. ئێمەیش بە دەست ئیشارەتی ناشیرینتر و جنێومان بۆ ئەکرد تا چووین بەگژ یەکا، بە هەردووکمان دەرەقەتی نەدەهاتین، بەڵام سەرخۆش بوو، خستمان چارمان نەبوو، ئەترساین، بە پشتێنەکەی فرەدریخ قۆڵمان بەست. لە پڕ، دەرگا کرایەوە غاردیان بە فەنەرەوە هاتە ژوورەوە، یەکێکی تری هێنا هەر لە ڕێوە کابرا (سی سی میقارووینا)ی گرتبووە دەم، جارێ غاردیان دەستەیێک کلیلی گەورەی بە دەستەوە بوو، کێشای بە سەروچاومانا، وتی:

- لێرەش پیاو ڕووت ئەکەن؟

قەدەرێکی لێ داین و ڕۆیی، ئینجا چووم بەلای ئیتاڵیانەکەوە وتم با ئەویش لەگەڵ ئینگلیزەکەدا یەک نەکەوێ وتم:

- (بونەسرا، سنیۆر) "یەعنی ئێوارە بە خێر".

زۆری پێ خۆش بوو وتی:

- (تاباکو).

زانیم داوای توتون ئەکا، بەرەورووی ئینگلیزەکەم کردەوە، دەستی برد بۆ کیسە توتونەکەی، نەیدایێ، چوون بە گژ یەکدا، ئێمە ئینگلیزەکەمان بۆ گرت تا کیسە توتونەکەی لێ سەند، قەندەمێکی لێ پڕ کرد و کیسەکەی دایەوە،

ئیتر دەنگی نەکرد، ئینجا مایەوە سەر ئاگر، هیچمان کبریتمان پێ نەبوو، لە بن میچەکە لامپاییکی بچکۆلە ئەسووتا، دەستمان نەئەگەیشتێ، بە هەموومان ئینگلیزەکەمان ئیقناع کرد چووەسەر پشتی، بۆڕیەی لامپام دەرهێنا سا قەندەم داگیرساند و ئینگلیز لە پڕ مێشی هاتێ و خۆی ڕاوەشاند منی خستە خوارێ و لامپایش کوژایەوە و نەوتەکەی بە سەرما ڕژا غاردیانەکان بە ڕاکردن هاتن، دیسان سەر و گوێلاکی ئێمەیان کوتایەوە، وتیان:

– خەریکن ڕاکەن؟ ئیتر چراتان بۆ داناگیرسێنین، جا بە تاریکی دانیشن.

سەیرێکی زۆر خۆشمان بوو، بە تاریکی ئینگلیز ئەیگوت: (یوو ئەڕ ئەن ئەس) ئیتالیان ئەیگوت: (سی سی دوورە میرە). زۆری پێ نەچوو، یەکێکی تریان بە تاریکی کردە ژوورەوە (وی وی ئاپسنت) ئەویش فرانسز بوو، کابرای فەڕەنگ کە بە تاریکی هاتە ژوورێ، پێی نا بە ئینگلیزدا، ئینگلیز لێی ڕاست بووەوە، دایە بەر زلە. تێک هەڵچوون، کەوتن بە سەر ئیتاڵیانییەدا ئەویش ڕاست بووەوە کەوتە شەڕە زلە. منیش وتم:

– فرەدریک ڕاستەوە بە، ئێمەیش هەر کامێکیانمان هاتە ڕەت پیاکێشین سا لەم کێشە و گیرەیەدا هاتینە ڕاستی پەنجەرە، سەری ئینگلیزی پیا کەوت، پەنجەرە شکا. لە شرنگەی پەنجەرە غاردیان هاتن، فەنەریان پێ بوو، هەموو خەتایان کردە مل ئێمە. دیسان قەدەرێکیان لێ داین، ئیتر زۆری نەمابوو ڕۆژ بێتەوە، وتیان:

– چی ئەکەن بیکەن؟ مەپرسە بە چە حاڵێ ڕۆژمان لێ بووەوە، پۆلیس هاتن بردینیانە لای قومیسەر، ئیستینتاقیان کردین، ئەووەڵەن وتیان:

– ئێوە جنگانەن (دۆمن)،

وتم:

– ئەگەر دزم بووینایە وا بە ئاسانی نەدەکەوتینە داوی ئێوەوە.

وتیان:

– ئەم پارەیەتان لە کوێ بووە؟

وتم:

– لە مونیخ شەوێک ئاهەنگمان بۆ (یۆهان برۆمەر) کردووە ئەوەی پێ بەخشیوین،

وتیان:

– ئۆف، زۆر چاکە، ئەگەر ئێوە لە ماڵی ئەو پیاوە بووبن بەرتان ئەدەین،

وتم:

– چۆن ئەزانن ئێمە لەوێ بووین؟

وتی:

– بە تەلغراف ئەپرسین.

وتم:

– تەلغراف کێیە و چۆن ئەگاتە مونیخ؟ ئێمە ئەزانین مونیخ چەند دوورە، خۆ ئەو لە ئێمە ئازاتر نییە.

قومیسەر تووڕە بوو وتی:

– قەشمەریمان پێ دەکەی؟

وتم:

– نەوەڵڵا.

وتی:

– ئێوە کە بە ڕێدا هاتن[۱۲۷] ناو بەناو نەتاندی دار داچەقاوە و تەلی بەسەرەوەیە.

وتم:

- بەڵێ وەڵڵا دەمدی، بەڵام وام دەزانی ئەوە بۆ ئەو زەوییانەیە کەس بە ناویا نەڕوا، چونکو لای ئێمە لە دەوری زەوی دار دەچەقێنن تەلبەندی دەکەین.

ئینجا ئێجگاری تووڕە بوو، ئێمەی کردەوە بەندیخانە.. دەمی ئێوارە بانگیان کردینەوە.. ئینجا بە پێکەنینەوە بەرەڵڵای کردین و پارەکەیشی داینەوە. وتم:

- بۆم بژمێرە بزانم تەواوە.

دیسان کەر تڕییە برایەتیمان، تووڕە بوو، وتی:

- بۆچ تۆ بە ژمارە داوتە بە ئێمە؟

وتم:

- نەخێر هێشتا خۆیشمان نەمانژماردووە..

وتی:

- لاچن لە پێش چاوم.

ئیتر هاتینە دەرێ. تا تیامانا بوو ڕامان کرد. خەڵکی کەوتنە دوومان.. وتم:

- فرەدریک با دەستێ جل بکڕین خەڵک بە پیاومان بزانن.

منداڵێ گوێی لێ بوو. وتی:

- وەرن بتانبەمە موغازەی جل.

پێشمان کەوت بردینە موغازەیەک. وتی:

- تاقمیان دەوێ.

خۆی ڕۆیی کابرا چوو تاقمێ جل و قایشی ولاخی عەرەبانەی بۆ هێناین. ئێمە تووڕە بووین. وتمان:

- خۆ ولاغ نین.

وتی:

– بۆچی ئێوە عەرەبانەچی نین؟

– وتم: نەخێر.

وتی:

– کەواتە بۆ خۆتان باشە.

لەو قسەیەک و لە ئێمە قسەیەک، چووین بە گژ یەکدا.. دیسان پۆلیس پەیدا بوو، وتی:

– خۆ ئێوە ئێستا لە بەندیخانە هاتنە دەرێ.

– وتمان:

– چی بکەین؟ هاتووین دەستێ جل بکڕین، پیاوە تاقمی وڵاخمان دەداتێ، پۆلیس پێ کەنی، بردینیە موغازەی مۆدێل، هاتن بە پیرمانەوە و جگەرمیان داینێ.. وتیان:

– جلی چۆنتان دەوێ؟

وتم:

– جلی پیاوەکانی ئەو شەوەی ماڵی یۆهان.

وتیان:

– باشە. ئەم جلانەیش لە فابریقەی یۆهان کراوە.

دەستێ جلی بالو[128] – یان بۆ هێناین[129]

*

## ڕەندی بە پیری

کاتێ دەستم کرد بە ڕۆمانی کەمانچەژەن، دڵ و دەروون گەش و ڕوون بوو، هەموو کەس ئارەزووی قسەی خۆش و پێکەنین و خۆش ڕابواردنی ئەکرد. بۆ جلدی دووەم زۆر کەس ڕووی لێ نام، ئەوسا دەستم نەدەڕۆیی، تا هات کاغەز وەرەکەب و خواردەمەنیش گران بوو، ئیتر وتم ڕابورد، ئەو کتێبەم بۆ تەواو نابێ.

لەم چەندانەدا ڕۆژێکی خۆش بە هەوای "هەوای دەشت" چوومە کەناری ئاوی بەندەکەی ژوور ماڵی خۆمان، لەوێ نازەنینێک شوێنێکی شاعیرانەی هەڵبژاردبوو لەناو چیمەن و گوڵزارەدا، کتێبێکی بە دەستەوە بوو، دوو منداڵیش ئەمدیوە و دیویان گرتبوو، وەک دوو باڵی پەری، تیشکی ڕۆژەکە دابوویە ڕوومەت و گەردنی و لەوێوە لە سەر کاغەزێکی کتێبەکە بریقەی ئەدایەوە، خۆ من بە ناو و داو پیرم، بەڵام بە ڕاستی لە ڕاستی ئەو جوانییە، عیشق و جوانیێک گەڕایەوە و گڕی دام و گوڕی دایە دڵم. هێزی پێم نەما، خۆم دا بەسەر کاڵۆکەکەما و بە لارەوە هەڵوەستام، مەولەوی ئەفەرمێ : عاشق بە سەد ساڵی بلووغ ئەبێ، تا ئەو دەمە، دەم و لێو و زیو و سێوی وام نەدیبوو. نەمناسی تومەز ئەو منی ئەناسی، لەبەرم هەستا، ئیختیار بێ ئیختیار بوو بە شاعیر، ئەمویست بیدوێنم، پرسیم:

– لە کوێوە کەوتیتە ئەم چیمەنە؟

من وەم زانی ئەڵێ لەبەهەشتەوە، کەچی وتی:

– لە سەرقەبرانەوە.

نیکتەی مەولەوی و ئامینەخانی لە ژیاندا دیبوو، منیش خاوەندی ڕووحی

مەولەوی بووم، وتم:

– ئەی بۆچ؟ لە ئامینەخان خۆش و جوانتر؟

وتی:

– ئەوە نییە تۆم کێشایە بەردەمی خۆم.

ئامینەخان کە مەولەوی وتبووی ئەی بۆچ؟ یەعنی تۆ چوویتە سەر قەبران بۆچ مردوو زیندوو نەبوونەوە؟ ئەویش وتبووی ئەهلی دڵی وەک تۆیان تیا نەبوو. ئەم بە شێوەیێکی بەخۆدا ڕاپەرمووبی وای گەیاند کە ئەوەتە تۆم زیندوو کردووەتەوە، ڕوخسار و گوفتار ئەمە.

منیش بۆ بیانوو ئەگەڕام کە بیدوێنم، وتم:

– ئەوا تێ گەیشتم ڕووحی مەولەوی بۆ تۆ باشتر ئەژی و بە شیعر ئەدوێی. کە وا بوو تێم بگەیێنە نووری مانگ لە ڕۆژەوەیە بەڵام مانگ بەشەو بە شەوقە، من مانگ لە ڕۆژدا ئەبینم، ئەمە چییە؟

– وتی:

– قوربان شاعیر، نایێ لە فەلکییات بدوێ، هەرچی شاعیرێک کە تەشبیهی جنسی لەتیفی بە مانگ کردووە، هەموو سەهون، چونکە مانگ کوڕە، شەوقی لە ڕۆژەوەیە، یەعنی سۆز و عیشقی کوڕ لە کچەوەیە، بەڵام ئەمە واتەی کۆنە، سۆز و عیشق نەماوە، ئیستا پارە و سوارە باوە، منیش ئاوێنەم نییە، مەگەر تەماشای دڵی تۆ بکەم، شاعیر زۆریان خەیاڵین.

زۆرتر نەدەلوا ڕاوەستم، هاتم بڕۆم، وتی:

– نەتزانی، ئەم دوو کتێبە چین وا هێناومە لەم شوێنە شیرینە ئەیانخوێنمەوە؟ یەکێکیان مەولەوییە و ئەویتر کەمانچەژەنە، مەولەویت تەواو کردووە بەڵام کەمانچەژەن مەراقێکت تووش کردووین نابڕێتەوە، تۆ ئەگەر بۆمان تەواو نەکەی.

بەو سۆزەوە و بەو شێوە شیرینە هیچ چارم نەما بەڵێنم پێ دا ئەوا بە

یاریدەی خـودا دەسـتم پێ کرد، ڕەنگە ئەو لە مـەراق دەرکەم، بـەڵام مـەراقی چاک بۆ من مـاوەتەوە کە نەمزانی کێیە؟ ئێسـتـایش هـەر ئەپرسم نازانم کێ بووە. هیچ شک و شوبهەم نەماوە کە پەری بووە، ئەگینە سۆراغم ئەکرد، خۆ من کێوی قـافم دیوە، ئەو هەموو گورجییە پەرییانەم چاو پێ کەوتووە، وێنەی ئەو نەبووە، وا بەرزە یۆنای ناکەم[١٣٠].

## ١

ئێمە سەعادەتی ئەلفرێد موللەر و یاوەرەکەی فرەدریخ شوللەرمان لە مەغازەی کۆستیم، یەعنی تاقمی چاکەت و پانتۆڵ بەجێ هێشتبوو، ئەگەرنا ئێستا جل و جەواڵمان بۆ بکڕینایە جلەکانیان دەمێک بوو دڕابوو، بەرەکەت دا، تازە شاگردەکە چوو دەستێ جلی بالووی بۆ هێنا. جا بێینەوە سەر ئەمە، ئەلفرێد خۆی بیگێڕێتەوە، ئەڵێ:

– کە جلەکانی هێنا، مەغازەچییەکە بردینیە ژوورێکی تاریکەوە.

وتی:

– لێرە خۆتان رووتەوەکەن، کەس چاوی لێتان نییە.

تێ فکریم لەودیو پەردەکەوە شاگرد فیقەفیق پێ دەکەنن، من سەخت بووم[١٣١]، تەمام بوو ڕووت نەبمەوە، مەغازەچی بە زبانێکی خۆش وتی:

– ئەم ڕووتبوونەوە، هیچی تیا بەستە نییە، هەرچی بێ بۆ جل کڕی لێرە ڕووت ئەبێتەوە، خۆ ئێوە ژن نین هیچتان دەرکەوێ.

تێ فکریم، فرەدریخ لە پێش منا ڕووت بووەوە، زاتم شکا، ڕووت بوومەوە، تەنها دەرپێکەم لە پێدا بوو، بەجارێ شاگردەکان دەستیان کرد بە پێکەنین، سەگبابێکیان وەک سەیری تیاترۆچی بکا بە پراوە پراوە چەپڵەی بۆ لێ دام. من لە کابرای مەغازەچی تووڕە بووم، کەچی بە پێکەنینەوە دەستی برد دانتەلە و فیستۆی دەرپێکەمی نیشان دام، تومەز ئەو شەوەی لە ماڵی یۆهان پیس بوو بوو، کچەکە دەرپێی خۆی دابوومێ، بە دەرپێی ژنانەوە هاتبووم، هیچ لە بیرم نەبوو دەرپێ بگۆڕم، کاری ڕاست بێ شاگردەکانی دوورخستەوە، چوو دەرپێ و فانیلەی پیاوانەی بۆ هێنام، ئەوانەم گۆڕی، لە

سەر ئەوە کراسێکی (قولە) داریان لە بەر کردین، بەڵام یەخەکەی زۆر ڕەق بوو، ملم دانەئەنەوییەوە، وتم:

- بابە من ئەم تەوقە لەعنەتەم ناوێ.

- هەرچەند هاوارم کرد ئەو هەر ئەیگوت:

- ئۆف ئۆف چەند تەتەیە.

- ئینجا بالتۆلۆنی لە پێ کردین کە یەلەک و فیراقەکەمان[١٣٢] لەبەر کرد، بردینیانە بەر ئاوێنە، لە پشتەوە ئەوەندە درێژ بوو وەک کلکم لێ ڕوابێ وابوو، دەستم برد دای کەنم، مەغازەچی وتی:

- نامەرد نەکەی، پیاوی زۆر گەورە ئەمانە لەبەر ئەکەن، تۆ خۆت بچووک مەکەرەوە.

- ئیتر خۆم نەشکاند وتم:

- حیساب بکەن جلەکانمان بایی چەندە؟

وتی:

- جارێ زۆرتان ماوە.

- نیازت وایە هەموو پرپاتاڵ و جل و جەواڵی مەغازەکەمان بە سەرا ساغ بکەیەوە؟

- دەباشە.. ئەی بە سەری ڕووت ئەگەڕێن؟

لێکم دایەوە، ڕاست ئەکا، وەک ئەم زەمانە نییە بەسەری ڕووت بگەڕێین، ئەوسا بە هەرچی سەری ڕووت بوایە ئەیانگوت سەری ڕووت بە دوای کەر.

دوو شەبقەی درێژی سیلندەریان بۆ هێنایین. حیسابی کرد، بایی نۆ لیرە و نیو بوو، بە خەشیمیان زانیوین یەک و دوو پارەیان لێ سەندین، گوایە ئیکرام، یەکی باستوونێکیان بە خۆڕایی داینێ، ئینجا وتمان کەواتە جلە کۆنەکانمان لێ بکڕن، وتیان کۆنەفرۆش نین بەڵام بە شاگردەکەدا ئەینێرم

بیفرۆشێ، ئێمە لەوێ دانیشتین، شاگردەکە جلەکانی برد قەدەرێکی پێ چوو، هاتەوە نیو لیرەی بۆ هێناین، ناچار وەرمان گرت و هاتینەوە دەرێ.

توورەکەی کەمانەکەم بەو جلانەوە لەبن باخەڵدا بوو، پێمان نایە کۆڵان و خەڵک دەستیان کرد بە پێکەنین، ئەی دوات برێ تەڕپیر، لە هەموو شوێنێ ڕووحی حازرە پێمان پێ ئەکەنن، گوێمان نەدایێ، چووینە ئوتێلێک، وتم:

– ئۆدەیێکی دوو کەسیمان ئەوێ.

بردینیان لە ئۆدەی بەردەرگاکە قەیدیان کردین و لە قاتی سەرێ ئۆدەیێکی تریان نیشان داین چووینە ژوورێ، کەمانەکەم بە سنگێدا هەڵئاوەسی، نەختێ دانیشتین، ماندوومان حەسایەوە، وتم:

– فرەدریخ با نەختێ بچینە دەرەوە بگەڕێین، بە زۆر و بە خواهشت ملی دا بێ، بەلام وتی:

– ئەلفرێد تۆ بۆ قۆزییەتی هاتووی یا بە شوێن یارتا بگەڕێیت؟

هەناسەیێکم هەڵکێشا وتم:

– بە خوا ڕاست ئەکەی وتی ئەو کاتبەی ناوی ئێمەی نووسی پیاوێکی زیرەک و نازک دیار بوو، بابچین بزانین ئەو چیمان بۆ ئەڵێ.

چووین سلاوێکمان کرد و لەبەرمان هەستا وتی:

– ئەمر کەن.

وتم:

– ئێمە غەریبین ئافرەتێکمان لێ گوم بووە، بە شوێن ئەوا ئەگەڕێین، تەدبیرمان چییە؟

وتی:

– تەدبیر ئەوەتە ئیعلان بدەن بە غەزەتە.

– غەزەتە چییە؟

ئەحواڵی غەزەتەی تێ گەیاندین، وتم:

– کەواتە، کاغەزێک و قەڵەم و دوێتێکم بدەرێ خۆم ئیعلانەکە ئەنووسم، تەبەقێ کاغەزی دامێ و قەڵەم و دوێتی نایە بەردەمم دەستم بە نووسین کرد:

"ئەلفرێد موللەر ئەفەندی لە ئیـیالەتی ناویرا لە دێیێکی بچووک زۆر دەمێکە لە دایک بووە، خەبەر دایکی نەماوە، لە باوک بووە هەژدە ساڵ لەوێ ژیاوە، دوایی باوکی دەری کردووە، لە ڕێ بە خزمەت خانمەکەی و تەرپیر گەییوە، لەگەڵ خۆیان بردوویانە، ئەو دوو ئافرەتە و عەرەبەچییەک و چوار بارگیری لێ گوم بووە، بە شوێن ئەوانا هاتووە (ویانە)، قەرار وابوو کە ئەوان بێنە ویانە.

ئەلفرێد موللەر ئەفەندی کەمانێک لێ ئەدا، هەرچی گوێی لێ بێ عاشقی کەمانەکەی ئەبێ، زاتەن ئەوانیش لە بەر کەمانەکەی خۆشیان ئەوێ، ئێستا هاتووەتە ویانە جلەکانی ئەو شەوەی ماڵی یۆهان لەبەردا نەماوە، گاڵتە بە دەرپێکەی بکەن، ئێستا بە فیراق و شەپقەی سیلندرەوە پیاوێکی ترە، کەس نایناسێتەوە، کەمانەکەی لە ژوور سەری هەڵئاوەستیوە، لە شوێن ئەو ئافرەتانە ئەگەڕێ کە لێی گوم بوون، تا نەیاندۆزێتەوە، ناویان ناڵێت، نیهایەت ئەمەندە ئەڵێ خانمەکەی کچێکی زۆر جوان و شیرین و قسە خۆش، ئافرەتەکەی تر، تەرپیرێکی مۆن و دەنگ زل، هەمیشە پێ ئەکەنێ، وایش پێ ئەکەنێ وەک بەرد بە بەردا بدا، ئەم دوو ئافرەتە هیچیان لە یەک ناکەن و بە تەقدیری خوا هەمیشەیش بە یەکەوەن، ئەرابەچییەکەیان زۆر تووڕەیە، ڕەنگی بارگیرەکانم لەبیر چووەتەوە، بەڵام ئارەبانەکە لە پشتەوە جێی خزمەتچیی هەیە، ئەلفرێد ئەفەندی لە ئوتێل ئەبێ، هەرکەسێ ئەوانەی دۆزیوەتەوە مژدەی خۆی بسێنێ هۆۆۆ.. ".

کاتبەکە لە پشتمەوە سەیری نووسینەکەی ئەکرد، جار جار بزە ئەیگرت، وتی:

- کاکە ئەم ئیعلانە زۆر دوور و درێژە، پارەی زۆری ئەوێ.

وتم:

- قەید ناکا.

دامێ و ئەویش ناردی بۆ غەزەتە.

چووینەوە ئۆدەکەی خۆمان، لێی ڕاکشاین، سا زۆری پێ نەچوو، بە پەلەپیتکەیەکی لە دەرگای دا، وتم:

- خۆ دانەخراوە بۆچی لێی ئەدەی؟

- تێ فکریم غارسۆن هاتە ژووێ (ڕوومرانس)ێکی کێشا (کوڕنۆش) وتی:

- سەعادەتی ئەلفرێد ئەفەندی تەنەززول ئەفەرموون تەشریفتان بێنە خوارێ بۆ سالۆنی نان خواردن، کە تابل دۆت نان ئەخۆن.

وتمان:

- باشە وا هاتین، هەڵساین چووینە خوارێ، سالۆنێکی گەورە بوو، پێمان نایە ژوورەوە، هەموو دەستیان کرد بە پێکەنین. فرەدریخ وتی:

- ئەلفرێد خۆ تەڕپیر لێرە نییە، ئەمانە بۆچ پێ دەکەنن.

نیازمان بوو بگەڕێینەوە، غارسۆن[١٣٣] بە ڕوویێکی بەشووشەوە وتی:

- ئێوە بە شەپقەوە هاتوونە ژوورەوە و شەپقەکان بدە بە من، خۆتان فەرموون دانیشن.

چووین لە کەنارێکەوە لە سەر ماسەیێک[١٣٤] دانیشتین یەکێک هات وتی:

- چی مەیل ئەکەن؟

- چیتان هەیە؟

هەر لە خۆیەوە ئەویش پێ کەنی، چوو کاغەزێکی درێژی هێنا، دایە دەست من، وتی:

– ئەمە لیستەیە، فرەدریخ خوێندەوار نەبوو، من خوێندمەوە، ئەو گوێی گرت، نووسرابوو:

–بیفتک

– چییە؟

– منیش نازانم

– لای بە.

– ڕووزبیف

– چییە؟

– نازانم

– فرێی دە

– ئاوی گۆشت

– گۆشتی تیایە؟

– با، لە غارسۆن پرسین

– نەک عەیب بێ

– بووکی ئینگلیزی

– ماڵی ئینگلیزم ناوێ

– سەلاسەی ئیتاڵیا[١٢٥]

– هاە ئەمە باشە

غارسۆن لە پشتمانەوە وێستاوە توند دەمی خۆی گرتووە خەریکە ئەویش پێ بکەنێ، لێی توند بووم وتی:

– تۆیش بێ ئەدەب پێمان پێ دەکەنی؟

– وتی:

– ئەستەغفیروڵلا، باوێشک ئەدەم.

- سا، کەواتە برۆ سەلاتە بێنە

- قوربان بە سەلاتە تێر ناخۆین، چشتێکی لە پێشەوە بخۆین، دیسان لیستەکەی دایەوە دەستمان، خوێندمەوە:

- فیلەتوو

- گۆشتی فیل چۆن ئەخورێ؟ فرووج،

- هاە گۆشتی مریشک خۆشە، ئەویش خۆشاوی سێو،

- ئایە ئەویش بە سەردا ئەخۆینەوە؟

بە غارسۆنمان گوت:

- دوو قاپ خۆشاوی سێو، دوو مریشکی سوورەوە کراویشمان بۆ بێنە.

- هەموویان بە جارێ بێنم یا، یەکە یەکە؟

- هەموویان بە جارێ بێنە، با ئەوەندە چاوەڕوانی نەکەین، دڵنیا بین.

غارسۆن ڕۆیی، لەو سەرەوە دەستییێکی[١٣٦] هێنا، شەش قاپی لەسەر بوو لە بەردەمی دانایین. سا، ئەو ئەمانەتەی دانا تەماشام کرد، ئافرەتەکان هەموو کەوچک و چەتاڵیان داناوە، سەیری ئێمە دەکەن، هێشتا ئێمە هیچمان نەکردووە، لێمان بوون بە جاسووس تێ فکریم غارسۆن باقەیێ کەوچک و چەتاڵ و کێرد و دوو باگردێن شووشەی هێناوە کەوچک و چەتاڵی لەسەر دانێین، بە خوا ئێمە دەستمان بۆ هیچیان نەبرد، قۆڵمان لێ هەڵماڵی و بە چنگ بەربووینە سەلاتەکە، وتمان با جارێ لە پێشەوە ئەمە بخۆین ئیشتیهامان بکرێتەوە، سەلاتەکە سرکەی زۆر پیا کرا بوو، ترش بوو، خۆشاومان بە کاشییەکە بەسەرا هەڵقوڕاند دەممان شیرین بێ، خۆش بوو دەمێکم بۆ تەقاند لەپڕ لە هەموولایێکەوە قاقای پێکەنین پەیدا بوو، ئاوڕم دایەوە هەموو بە ئێمە پێ دەکەنن، وتم:

- فرەدریخ چی بوو؟ وا دیسان بووین بە مەسخەرە؟

وتی:

- نامەرد، ئابڕوویان بردین، وا بزانم هی ئەوەیە کە بە کەوچک و چەتاڵ نەمانخواردووە، با ئێمەیش دەست بدەینە کەوچک و چەتاڵ،

ڕۆن زەیتوون و ترشاو و سەلاتەکەمان بە دەستەوە بوو پەچەتەی[127] جوانیان لەناو پیاڵەی ئاوخواردندا وەک فەنەر بە چین چین قەد کردبوو، هێنامان دەستمان پێ سڕی و چەتاڵمان لێ گرت بە دەستەوە، خۆ تەنها مریشک مابوو، فرەدریخ نووکی چەتاڵەکەی لە مریشک گیر کرد، بە جارێ هەمووی هەڵگرت، بە گاز تێی بەربوو، منیش وتم بە خوا ئەمە باشە، بۆچ هەموو جارێ لێی بپچڕم و دای نێمەوە، وەک ئەو چەتاڵەکەم تێ چەقاند و هەڵم بڕی، تومەز زەریف لێی گیر نەبوو بوو، لە چەتاڵ بەربوو پەڕییە خوارێ، توولەی مادامێک لە بن مێزەکەدا بوو پەلاماری دایێ فڕاندی. فرەدریک هات توولە بترسێنێ و پێی فڕێ داتەوە، بە دەنگێکی بەرز وەک کەماڵ لە توولە وەڕی (حەپە حەپ)، توولەکە ترسا مریشکەکەی فڕێ دا، بە جارێ لێیان کردینە چەپڵە ڕێزان، ئینجا توولەیش لێمان کەوتە وەڕین، ناچار هەڵسان و ڕامان کرد، چووینە ئۆدەکەی خۆمان.

گارسۆنەکە شەپقەکانی بۆ هێنایینە سەرێ و پارەی خواردەمەنیشی لێ سەندین، شەوێ زۆرمان برسی بوو، سەد ئاواتم بە توورەکەکەی ئەووەڵ ڕۆژ خواست کە لە ماڵی باوکم قنچکە پاسدیرمە و لەتکە هەرمێم تێ کرد بوو، سبەینێ فرەدریخ وتی:

- ئەلفرێد من ڕووم نایێ جارێکی تر بچمە خوارێ.

منیش وتم:

- ڕاست ئەکەی جارێ من زۆر ماندووم و بەیانیش زوو هەڵدەسم با بنووین.

سا لەسەر جێ ڕاکشاین، فرەدریخ وتی:

- کاکە شەوقی لامپاکە لە ڕاستی چاومە، فێری چرا نەبووم، خەوم لێ ناکەوێ، با نەختێ کزی بکەین.

لامپا لە ناوەڕاستی سەقفی ئۆدەکە بە هیچمان نایگەینێ، چی بکەین؟ مێزێکی خڕیان دانا بوو، سوراحیی ئاو و بارداخی لەسەر بوو، شووشە و مووشەمان لابرد، مێزمان کێشایە ڕاستی لامپا. بۆ ئەوانە خۆم خێرام خۆم هەڵدایە سەر مێز، دەستم نەگەیشتە ڕاستی پلیتەی لامپاکە کزی بکەم، نەختێ خۆم هەڵدا، دەستم کەییە ڕاستی دوگمەی فتیلەکە، بام دا لە پەلە پەلییاندا ئەوەندەم بادا بوو بە جارێ کوژایەوە، لە تاریکیدا ماینەوە، بە پەلەکوتێ دەرگاکەم دۆزییەوە، چوومە دەرەوە، ڕاڕەوەکە چرای لێ ئەسووتا، بانگم کرد:

- هۆ هۆ کێ لەوێیە؟

دەنگێکی نازک جوابی دایەوە، وتی:

- فەرموو.

کە هاتە پێشەوە ڕوانیم ئافرەتێکی جوانە، شەرمم لێ هات بڵێم وەرە چرامان بۆ داگیرسێنە، وتم:

- خزمەتچیی ئووتێلم ئەویست.

وتی:

- فەرقی نییە منیش مووەزەفم.

عەجائیبم لێ هات، ئافرەت بە شەو ئێشکچیی ئوتێل بێ وتم:

- خانم تۆ هیچ ئیشی ترت دەست ناکەوێ؟ وا بەشەو بە دیار ئەم پیاوانەوە ئەبی.

- خۆ مشتەرییەکان هەموو پیاونین، ئافرەتیشیان تیایە.

- ئەی ئەگەر پیاوێکی بێژن و بێکەس لێرەدا بێ بەزمییتان[١٣٨] پیا نایێ؟

– ئێمە بەزمیمان پیا بێتەوە بڵێین چی؟ خۆ ناچینە باخەڵیان، چونکو بێناموسیمان لێ ببینن، دەست بەجێ جوابمان ئەدەن.

– لەبەر چرا، سنگ و گەردنی وەک ئەڵماس ئەدرەوشایەوە، قەت واش نەبووم، بەڵام ئەزانم عەشقی جلەکانم بوو، چی بوو، وەختە بوو بۆی شێت بم، وتم:

– ئینجا ئێوە ئەگەر بە دزییەوە ڕەحم بە کەسێ بکەن، نیو سەعات لەگەڵی ڕابوێرن، کێ پێی ئەزانێ؟

– جارێ گوم نابێ، دووەم فێر ئەبین.

لەم گفتوگۆیەدا بووین، دەنگی زیلێک هات، وتی:

– بە دوعا، من بانگ ئەکەن.

ڕای کرد، ڕۆی، قەدەرێ لەبەر سەرما وەستام نەهاتەوە، ناچار چوومە ژوورەوە، بە پەلەکوتێ جێگاکەم دۆزییەوە، بانگی فرەدریکم کرد، لە هەزار ساڵان ڕاست بووبووەوە، منیش سەرم کرد بە ژێر جێگادا ڕاکشام، ئەمما تا درەنگێ ئەو سنگ و گەردنەم لە پێش چاو بوو، خەوم لێ نەدەکەوت، ناچار ئاخری نووستم، دیتە درەنگ نووستبووم، بەیانی درەنگ خەبەرم بووەوە، بە وەڵڵا خەبەرم نەبووبووەوە، کاتبەکە هەڵی ساندم، غەزمەتەیێکی بە دەستەوە بوو، وتی:

– وا جوابیان داویتەوە.

لە خۆشیانا گەشکەدار بووم، دەستم کردە ملی کابرا، توند هەڵم گوشی، هەر ئەوەندەی پێ کرا، غەزمەتەی فڕێ دا و ڕای کرد، بۆی دەرچوو. ئینجا هاتمەوە وێزەی فرەدریک، نووستبوو، خۆم دا بەسەریا، وەختە بوو هەموو پەراسووی بشکێنم، چاوی کردەوە، وتی:

– (وەحە وەحە) بۆچ وا بەلەسە بووی؟

وتم:

- کوره ڕاستەوە بە، سەیرکە ئەم غەزەتەیە بخوێنەرەوە،

لە تاواندا لە بیرم نەبوو کە نەخوێندەوارە، وتی:

- کابرا تۆ بۆچ عەقڵت شێواوە، کەی من خوێندەوار بووم؟

وتم:

- وا بۆت ئەخوێنمەوە، گوێت لێ بێ. بۆم خوێندەوە، نووسرابوو:

"ئەفەندی ئەلفرێد موللەر

ئەوژنەی لە دوای ئەگەڕێیت، من ئەیزانم، ئەودوو ژنە، کچەکەیان ناوەکەی حەرفی پێشەوەی یا دەنگدارە یا بێدەنگە، باڵای نە کورتە، نە درێژە، ڕەنگی نە سپییە نە ئەسمەر، چاوی نە گەورەیە نە بچووک، لووتی نە کورتە نە درێژ، ئێوارە وەرە (قافەوین)[١٣٩]، لەوێ تەفسیلاتت ئەدەمێ، کە خوێندمەوە فرەدریک سەرێکی لەقاند وتی:

- هەی هەی بەم خەبەرە میقائیلللا ئەدۆزیتەوە، جارێ پێم بڵێ حرووفی دەنگدار و بێدەنگ چییە؟ ئەوانە چین وا ئەبارێنن، دەنگ ئەدەنەوە؟

وتم:

- فرەدریک ئەم چەنە بازییەت لە چی؟ هەڵسە خۆت گردەوەکە بابچین بۆ (قافەوین).

- وتی:

- مردووت مرێ تۆ هێچگار فرت بەسەر دنیاوە نەماوە، پارچە کاغەزەکەی کە ئەڵێیت ئەبارێنێ، وتوویە ئێوارە وەرە، تۆ هێشتا هەتاو نەکەوتووە کەوتوویتە سەما.

- ئاخر فرەدریخ نازانی چە ئاگرێکم تێ چووە. ناتوانم دانیشم، هەڵسە با بکەوینە کۆڵانان.

ئیتر خوا حەقە، فرەدریک سەرپێچیی نەکرد، هەڵسا و شوێنم کەوت

چووینە دەرێ فرەدریک وتی:

- ئێمە بچینە دەرێ بکەوینە کۆڵانان گوم ئەبین، با یەکێ پەیدا کەین رابەری و شارەزاییمان بۆ بکا.

ئێمە لەم گفتوگۆیەدا بووین، یەکێ لە دوامانەوە گوێی قوت کردبووەوە. ئاوڕمان دایەوە هاتە پێش دەممان شەپقەکەی داگرت (ڕەوورانس) کڕنووشێکی برد، وتی:

- وا بزانم ئەفەندییەکانم تازە تەشریفیان هێناوەتە ئەم شارە و شارەزا نین، ئەگەر ئارەزوو ئەفەرموون لە خزمەتیاندا دێم ئەگەڕێین ڕابەری دەکەم.

زۆرمان پێ خۆش بوو، وتمان:

- های های وەرە لەگەڵمانا بزانین لێرە کوێ خۆشە بچین وەقت ڕابوێرین.

وتی:

- باخچەی حەیواناتی وەحشییە، یەعنی دڕندە خۆشە.

کە وای گوت، من داچڵەکیم، وتم:

- برادەر دڕندە پیاو ئەخۆن.

وتی:

- خێر زۆر توند بەستراونەوە، ناتوانن جم بدەن، سەیریان خۆشە.

وتمان:

- کە وایە با بچین بۆ ئەوێ.

سا، ئێمە ئەمەمان وت و نەوت، کابرا ڕای کرد گورج ئەرابەچییێکی بانگ کرد، سوار بووین و کابرایش هات لە بەردەممانا قوت بووەوە، فرەدریک لێی پرسی:

- بێ قەیدی بێ، ناوت چییە؟

وتی:

- (مۆریس)ی خزمەتکارت.

نیو سەعات ڕۆیشتین گەیشتینە بەر دەرگانەیێکی[١٤٠] زۆر گەورە، لەوێ دابەزین، پارەی ئەرابەچیمان دا، مۆریس وتی:

- پارە بدەن بلیتی دوخوولییە وەرگرم.

وتمان:

- دوخوولییە چییە؟

وتی:

- ئەی هەموو مەسرەف و بینا و پاسەوان و خۆراکی ئەم حەیوانانە خۆڕاییییە؟

- پارەمان دایێ بلیتی وەرگرت.

کە چووینە ژوورەوە هەتا چاو کار بکا باخچە بوو، لە پێشدا وەم زانی هیچ نەبێ بە قەد باخچەی شاتۆکەیە، کەچی دە ئەوەندە زل بوو، جارێ لە سەر ڕێ ئەمبەر و ئەوبەر نزیک بە پەنجا دار چەقیبوو و لووتەوانەی بۆ کرابوو، لەسەر هەر دارێک تەیرێک هەڵنیشتبوو. تەماشای خەڵکیان ئەکرد، پرسیم،

- ئەمانە چین؟

مۆریس وتی:

- ئەمانە تووتی یا پاپاغانیان[١٤١] پێ دەڵێن، قسە ئەکەن.

وتم:

- ئا.. ئینشائەڵلا تەیریشمان لێ دێنیتە زبان.

کابرا وتی:

- خۆ ئەمە چشتێکی گران نییە، هەر ئێستا من ئەیاندوێنم.

چوو بەلای یەکێکیانەوە، ڕووی تێ کرد وتی:

- بەیانیت بە خێر.

تەیرەکەش دوندووکی داچەقاند ڕاست و ڕەوان وتی:

- بەیانیت بە خێر.

من لەمە عەجائیبم لێ هات، مۆریس پێم پێ کەنی، منیش قینم هەڵسا وتم:

- وا ئەزانی من ئەمانەم نەدیوە؟ من لەمە عەجایبتـرم دیوە، باوکم تووتییەکی بوو هەموو جارێ کە کاغەزی بۆ شوێنێک بنووسیایە، سفارشی[١٤٢] تووتییەکەی ئەکرد. ئەو بۆی ئەنووسی.

مۆریس هیچ نەشڵەژا، وتی:

- ڕاست ئەکەی، لێرەیش تووتیی وا هەیە ئەو کاغەزەی تووتییەکەی باوکت نووسیویە، ئەو ئەیخوێنێتەوە.

فرەدریک پرسی:

- تووتییەکە بە چی ئەنووسێ؟

من وتم:

- قەڵەمی ئەگرت بە دەندووکەوە.

مۆریس وتی:

- هی ئەم تووتییە ئاسانترە، بۆی ڕا ئەگرن، ئەیخوێنێتەوە.

کابرا لەبەر ئەمە پارەی زۆرمان لێ بپچڕێ منی بە درۆ نەئەخستەوە. فرەدریک پێی باوەڕ نەدەکرد.

ئینجا مۆریس وتی:

- بابچین سەیری ورچ بکەین.

- وتم:

- من ورچ بەبێ هونەر ئەزانم، نامەوێ بیانبینم، باوکم ورچێکی کوشتووە

ئەمانە (نەک)[143] تۆڵەی ئەو ورچەم لێ بستێنن.

مۆریس وتی:

– ئەمانە لە تەلبەندی ئاسنان زەرەر بە کەس ناگەیێنن.

راستی لە پێشەوە ترسام، کە وتی ئەمانە لە قەفەسی ئاسنان چەسارەتم پەیدا کرد چووین. سەیرمان کرد، سێ ورچی بۆر و چواری سپی وان لە قەفەسی ئاسنا، ئینجا لەوێوە بردینییە سەیری فیل، فیلێکی گەورە تەختێکی لەسەر پشت لە مەیدانا بوو، نەیشبەسترابووەوە، دەخڵی کەسی نەدەکرد، دوای ئەوە سەیری پڵنگ و رێوی و چەقەڵ و گورگمان کرد.

بردینییە مەیدانی باڵندە و مورغی عەجائیب عەجائیب. ماندوو بووین، لامان دایە غازینۆیێک[144] دانیشتین، غارسۆن هات وتی:

– چی ئەمر ئەکەن؟

مۆریس بە فرسەتی زانی، پێی گوت (بیرە)، هەر بیرەی هێنا و ئەو نای بەسەریەوە تا بیست و یەک بارداغی خواردەوە. رۆژیش لە ئاوابوونا بوو، پێنج مارقەیێکم نایە مستی وتم:

– برۆ خوات لەگەڵ، کابرا بە خۆشی خۆشییەوە هەڵسا رۆیی، ئێمەیش هاتینە دەرێ. لەبەر باغچەکەدا عەرەبە زۆر وەستا بوون، یەکێکمان بانگ کرد، سوار بووین، پێمان گوت بمانبە بۆ قافەوین، نیو سەعات رۆیین لەبەر بیراخانەیێکدا وەستا، دابەزین، غازینۆچی کە ئێمە بە فەراق و شەپقەی درێژەوە لەناو ئەرابەدا دی، هات بە لامانەوە و بردینییە جێیێکی تەنها و ماسەی[145] بۆ دانایین، وتی:

– چی ئەمر ئەفەرموون؟

من وتم ئەڵبەتە چشتێک ئەخۆینەوە، بەڵام یەکێک ئێمەی بۆ ئێرە دەعوەت کردووە، ئایا خۆی هاتووە یان نا؟

کابرا وتی:

– کێیە؟ وا ئێوەی بۆ ئێرە بانگ کردووە.

– کابرا بۆچ تۆ ناوی منت نەبیستووە؟ ئەلفرێد موللەر ئەفەندی.

– پێ خۆشحاڵ بووم وا ناوی شەریفتم زانی.

– تەئەسوف ئەکەم ناوی منت درەنگ بیست.

– چی بکەم؟ تا ئێستا تەشریفتان نەهاتووەتە ئێرە تا بە خزمەتتان بگەم.

– کورە ئەوی نەیشیدیوم ناوم ئەزانێ، حەتا قومیسێرەکەی ویانەیش ناوم ئەزانێ لە بەری کردووە، با بۆت تیکرار بکەمەوە، ئەلفرێد ئەفەندی، تەنها ئەلفرێدیش نا، موللەریشی پێوەیە، لە شوێن ژنێک ئەگەڕێم.

– قوربان دیارە بە خێر ژن دێنی، تۆ خۆت دۆزیوتەتەوە یا من بۆت بدۆزمەوە؟ سەهلە، تۆ جارێ سەری خۆت قورس بکە، شاگردەکەت لە خزمەتا ئەنێرم، عموومخانە[١٤٦] نزیکە.

– کورە کابرا تۆ چی ئەفلێتینی؟ من بە غەزەتە ئیعلانم کردووە.

– ها ها وا ئینجا زانیم، حەتا کە ئیعلانەکەیان لە غەزەتەدا خوێندەوە، هەموو مشتەرییەکان بە پێکەنینەوە دەست بە دەست ئەیانگێڕا.

– عوزرت لە قەباحەت خراپترە.

تەمام بوو لێی دەم فرەدریک کەوتە بەینەوە و وتی:

– بابا جارێ سەر و بیرەمان بۆ بێنە، هەر کەسێکیش هەواڵی ئێمەی پرسی بیهێنەرە لامان.

ئینجا وتی:

– بە سەر چاو، کاری تۆ ڕاست بێ شووشە و مووشەمان نەشکا.

کە ئەو ڕۆژی من بە فرەدریکم وت:

– ئەی فرەدریک وا من میقائیللام دۆزییەوە، ئینجا تۆ بۆ خۆت چی ئەکەی؟

– خوا ئەکا بە سەهلی و بەبێ شەڕ تۆ ئەو بدۆزییەوە، من لە پێشدا چۆنم گوزەران ئەکرد، هەر وا ڕەحەتتر ڕائەبوێرم.

– خێر، فرمدریک میقائیللام دۆزییەوە جێی تۆیش ئەکەمەوە، لە پێشدا منیان کردبوو بە گومرکچی، ئێستایش من تۆ لەسەر ئەو ئیشە دادەنێم.

ئێمە لەم گفتوگۆیەدا بووین، غازینۆچی هات وتی:

– پیاوێک بە شوێن ئێوە ئەگەڕێت.

– ئەی بۆچ نەتهێنا؟

– چوزانم سەفیلێکی ڕووت و قووت، وتم بەڵکو زاتێکی گەورەی وەک تۆ ئەو لەم شوێنە قبووڵ نەکا.

– ئەمان زوو بیهێنە.

نەختێ ڕانەبورد ڕوانیم سەرسەرییێکی ڕووت لە قیافەتی[١٤٧] ئەووەڵ جاری من خراپتر هاتە پێشەوە و دانیشت وتی:

– ئەفەندی من مابرم، دانیشت و دانەنیشت هەروا لە خۆیەوە بانگی کرد، کورە غارسۆن بیرە، ئەمما (سپانن) غەشی تیا نەبێ (دوبل)[١٤٨] بەبەرداغی دوو مەنی.

بیرایان بۆ هێنا، نای بەسەریەوە، قوڵتەیێک لە قوڕگییەوە هات بە جارێ ئەو بارداغە دووبەرداغییە چووە خوارەوە. بۆکرووز لەناو جەرگیەوە ئەهات، دیسان بانگی کرد، خزمەتچییێکی تر ئەویشیان هێنا، خواردییەوە، ئینجا پێم گوت:

– تۆ جارێ مەتڵەبی ئێمە بدە بەدەستەوە لە پاشا ئەتوانی و تا ورگت ئەگرێ بخۆرەوە، ئێستا هۆشت بە خۆتە، پێم بڵێ لە کوێیە؟

– کێ؟ لە کوێیە؟

– کورە خوا بتگرێ میقائیللا.

– کوره خوا تۆ بگریّ میقائیللا کێیه؟

– ئەی ئەم مەکرە چییە تۆ نەتنووسیوە ئەیناسم؟

– بەڵێ من نووسیومە ئەیناسم، لەسەر قسەی خۆم.

– ئەی بۆچ وا ئەڵێی؟

– ئەی هەروا بە خۆڕایی، باوە من پیاوێکی[149] فەقیرم، تەماشای سەر و پۆتەڵاکم کە و ئینجا بڵێ خەبەرم بدەریّ.

– وا تێ گەیشتم پارەت ئەویّ، چەند قرووشت بەمێ؟

– نۆف خوا موبارەکی نەکا بە قرووش ئەدویّ.

– ئەی بەچی بدوێم؟

– بە لیرە.

– ئەی با بە لیرە بێ، چەند لیرەت بەمێ؟

– خۆ لەگەڵ زاتێکی وەک تۆ گەورە نەخوازەڵا عاشقیش بی باسی کەم و عەشەرات[150] بکریّ، ئەبێ بە میئات[151] بدوێین.

فرەدریخ نەیهێشتە بەر من وتی:

– تۆ جاریّ من تێ بگەیێنە، عەشەرات و میئات چین؟ و لە کوێوە هاتوون؟

وتی وا دیارە تۆ لە خوێندنا پیادەی پێ پانی، بچۆ بخوێنە ئینجا وەرە لای من بدوو، ئەفەندی وا دیارە خوێندەوارە. ئەو ئیعلانە جوانە خۆی نووسیویە، چونکو ویانەیی ناتوانن ئەو جۆرە بنووسن. ئینجا ناچار خۆم هاتمە مەیدان وتم:

– بە ڕاست و ڕەوان بڵێ چەندت ئەویّ؟

وتی:

– هیچ نەبێ نیو میئات.

– لێکم دایەوە من لەم مژدەیەدا هەتا زیاتر ببەخشم لای میقائیللا قەدرم

زیاتر نەبێ، بەڵام ڕووی نەبوونی ڕەش بێ، خۆ بەم جلانەوە و لەم شوێنە قەڵەبالغەدا بیشڵێم نیمە، عەیبە، چی بکەم چی نەکەم؟ مات بووم، لێکم نەدایەوە مابر وتی:

– ئاغا بۆچ وا زوو کڕ بوویت؟ پیاو کە دەوڵەمەند بوو درەنگ پارەی لە دەست نەبێتەوە، مەگەر وەک جەنابتان هەوایێکی عەشقی لە کەللەدا بێ دەرگەی دڵ و دەرگەی کیسە پارەی بۆ ناگیرێتەوە.

– زۆر سوخت بووم[152]، وتم:

– بە عەقڵی ناتەواوی تۆ گوایە من ملیۆنێر و عاشقم؟ ئافەرین چاکت هەڵهێنا، وا برۆی ئەیدۆڕێنی. کە وام گوت نەختێ شلی کرد وتی:

– هەرچەند من زۆر فەقیرم، ناچار کەمێ تەنزیلاتتان بۆ دەکەم.

– چەند؟

– تا پێنج لیرەی بەبەرەوەیە، با چل و پێنج بێ.

– کیسەکەت پان و درێژ بۆ هەڵدرووە؟ نەختێ تەسکی کەرەوە.

ئەوان بەو سات و سەوداوە ئەڕێسن، بەڵام ئێمە کورتی نەکەینەوە. بە کابرایان گوت بە چوار لیرە ڕازی نەبی، هیچیشت نادەینێ و پارەی بیرەکانی کە خواردووتەوە غارسۆن بە تێ هەڵدان لێت ئەسێنێ، ناچار ملی داهێنا، وتی:

– دە بدەن چوار لیرەکە.

– وتمان:

– جارێ لە پێشەوە جێ و شوێن و نومرەی مەسکەنی ئافرەتەکەمان پێ بڵێ، پارەت حازرە.

لەو وەقتەدا حیسابم کرد چوار لیرە بدەم نیو لیرەم پێ دەمێنێ، جارێ ئەوەم لێک نەدایەوە. وتم:

- ده بڵێ.

وتی:

- ناوی ئافرەتەکە میقائیللا قورتسایە.

ئۆخەی وا ناویم بیست، لە خۆشییانا تەمام بوو هەڵسم ئەو دەمە پیسە ماچ کەم، فرمێسک گرتمی:

- جا، میقائیللا ئێستە لە کوێیە؟

- وا لە ئیتاڵیا و لە شاری ناپولی.

- ناپولی دوورە یا نزیک؟

- ڕۆیین ئەیزانێ.

- ئەگەر بە شەمەندوفەر بڕۆن نزیکە.

- شەمەندوفەر ئەرابەی پۆستە نییە؟

- خێر، ئەگەر بە ئەرابەی پۆستە بڕۆن دوو مانگ ڕێیە.

- شەمەندوفەر لە کوێ دەست ئەکەوێ؟ لەبەر ئەم غازینۆیە ناوەستێ؟

- خێر، ئەبێ بچیتە ڕۆژاوای (ویانە)، شەمەندوفەر لەوێ ڕائەوەستێ.

- بۆچ پیاوە ڕاوەستێ؟

- خێر، ئاسنە و بە ئاگر ئەڕوا، کە لێت نەخوڕی خۆی ڕائەوەستێ.

- باشە، ئەوا گەیشتینە ناپولی، لەوێ ماڵی میقائیللا لە کوێ ئەدۆزینەوە؟

- ئەچیتە دائیرەی پۆلیس، ئەپرسی خەبەرت ئەدەنێ.

- خۆ دائیرەی پۆلیسی ئەوێ وەک پۆلیسی ویانە من ناناسن، ئەبێ لەوە و پێش دوو شەو بمانخەنە بەندیخانەوە، تا دەبین بە دۆست.

- بۆچی ئەتخەنە بەندیخانە، تۆ ساحیبی ئەم قۆستومە بی، کەس شوبهەی منت لێ ناکا، با خوسووس کە تۆ هەواڵی عائیلەی قورستا بپرسی، هەموو کەس بە حورمەتەوە تەماشات ئەکات، چونکو عائیلەیێکی

زۆر شەریف و ناودارن.

کە وای گوت بە جارێ لە پێشەوە ناهومێدی و ماتەمێک گرتمی، چونکو کچێکی وا ناودار و خانەدان چۆن ئەبێ شوو بە من بکا؟

دوای ئەوە، کە نەزاکەت و ویجدان و شەفەقەتی میقائیلِلام لێک دایەوە و هێنامە پێش چاو، هاتمە سەر ئەوە ئەم کچە منی لە هەموو کەس زیاتر خۆش بوێ، چونکو من عەیبم تەنها فەقیرییە، ئەویش ئیحتیاجی بە پارە نییە، بێتە بازارِ خۆشەویستی، کە لە بازارِ هامسەریدا مەحەببەت لە هەموو چشتێ پێشترە، هەر من ئەزانم ئەوم خۆش بوێ، بە هەموو مەعنایێکەوە ئەیپەرستم. لە هەموو وەقتێکدا بێ فوتوور[۱۵۳] سەر و رووحی خۆمی لە رێدا ئەبەخشم، بەمە هومێدم هاتەوە دڵ، کابرام ئیزن دا و پارەی بیرمم دا، کە لێکم دایەوە، پێنج مارقم پێ ماوە، جا چی بکەین؟ وتم:

– فرەدریک حاڵ ئەمەیە.

وتی:

– خوا کەریمە.

بە پێیان ملی رێمان گرت، هاتینەوە ئوتێل، چووینە ژوورەوە، بۆی هات وتی:

– چیتان ئەوێ؟

وتمان:

– جارێ هیچ، بە کاتب بڵێ حیسابی مەسرەفی ئوتێلمان بۆ بێنێ،

ئەو رۆیی، کاتب هات، کاغەزێکی دوور و درێژ بە مارقەی ئوتێلەوە، هێنای و خۆی بەند نەبوو رۆی. کە تەماشام کرد، بێ ئیختیار ئاێکم کرد، فرەدریک وتی:

– ئەوە بۆچ هاوارت کرد؟

وتم:

- چۆن هاوار نەکەم، بیست و پێنج مارقە:

مارق

۱٦ پارەی نوێن و نووستن.

٦ خواردن.

۳ بەخشش

۲٥ مەجمووع

فرەدریک وتی:

- ئەمانە پیاو ئەڕووتێننەوە.

- ئێستا وا هەرچی قەوماوە قەوماوە، چارەیێک لێک بدەینەوە.

- چی لێک بدەینەوە؟

- ئەوا سەعات نۆ و نیوی شەوی لێ دا تا سەعات دە هیچمان قسە نەکەین، لە زەنی خۆمانا لێکی بدەینەوە، بەڵکو چارێ بدۆزینەوە.

دوای نیو سەعات فرەدریخ سەری هەڵبڕی وتی:

- ئەلفرێد، ئەوا شەو بوو بە نیوەشەو، هەموو کەس نووستووە، ئێمە سووکێ بۆی دەرچین، خۆمان دەرباز کەین.

- هەی قورم دا بە دەمتا، بە نیو سەعات لێکدانەوە ئەمەت دۆزییەوە، نازانی ئۆتێل بێ پاسەوان و نۆبەچی نابێ، شەو قاپییەوانی هەیە، دە فەرزەن لێرە دەرباز بووین، کۆڵان قۆڵی دەورییەی هەیە، ناڵێن بۆچ بەم نیوەشەوە کەوتوونە کۆڵان؟

- جا یەکێکمان نۆبەچییەکە بە قسە ئەگرین، یەکێکمان دەرچین تا دێت

بە شوێن یەکێکمانا، ئەمیتریشمان ڕاکەین. ئەمە چارەی ئێرە، چاری کۆڵانیش تۆ بیدۆزەرەوە.

– ئەمە ناکرێ، هەروا باشە، بەیانی ئەچینە دەرێ، ئەڵێین ئێستا دێینەوە و نایێینەوە.

– جـا، دوایی بماندەنە دەست پۆلیس، بڵـێن ئەمـانە دۆلاندریجی[١٥٤] و ئاینوئۆیون کەرن.

– کـە وا بێ بوێستـە، چشـتێکی ترم هات بە خـەیاڵا، بەیانی کـە چووینە دەرەوە، ڕاست ئەچینە ئەو مـەغـازەیەی جلەکـانمان لێ کـڕیون، جلە تازەکانیان ئەدەینێ و کۆنەکانی خۆمان لەبەر ئەکەین.

– ئینجا مەغازەچی چۆنی ئەوێتەوە؟

– هێـشـتـا تەواو قـەدی نەشکاوە، کـە وتمان بە کـەم لێـمـان بکڕنەوە دەستیشمان ماچ ئەکەن.

– باشـە وا جلە تازەکـانمان دایەوە، بەسـەر خـێـویا ئەی کـۆنەکـان لەو مەغازەیە نییە.

– دیسان شاگردەکە ئەنێرین بۆمان بکڕێتەوە.

– بەڵکو فرۆشتبێتی.

– ئەیهوو تۆ زۆر قووڵی ئەخوێنیتەوە، وا من خەوم دێ، جارێ با بنووین.

نووستـین. بەیانی من زوو خەبەرم بووەوە، فرەدریکم هەڵساند تەنبەڵ بوو، هەڵدەستـایە سـەر قنگ و خـۆی نەدەگرت، چووم هەندێ ئـاوی سـاردم هێنا، دام بە دەمـوچـاویا، کـەشکە گـرتی، لاڵ بوو، چاوی ئەبڵـەق بوو. ئینجـا من پەشیمان بوومەوە، قەدەرێکم لە خۆم دا، ئەو هێجگاری تۆقی، هەموو بەدەنی کـەوتە فـرتەفـرت، ناچار سـواری شـانـی بووم دام مرکـاند، هـەندێکم کـوتا، نەختێ ئارەقەی کرد، پاش قەدەرێ چاوی هەڵبری وتی:

– ئەلفرێد من چیم لێ بەسەرهات؟ لە خەوما ئەفڕیم.

وتم:

– له خەودا فڕین باشه.

ئینجا هاتین فانیله و کراسه قۆڵدارەکانمان لەبەر نەکرد، خستمانه بن باخەڵ و جلەکانمان بێ کراس و فانیله لەبەر کرد، له قاپی کاتبەکە کە ئێمەی وا دی، پێکەنی وتی:

– بەم تواڵێتەوە ئۆغور بێ؟

فرەدریک وتی:

– خۆمان ئەچینە حەمام و ئەمانەیش ئەبەین بۆمان بشۆن.

کاتب وتی:

– خۆ ئوتێل حەمامی هەیە، بێ پارە خۆتان بشۆن و جلشۆریش هەیە بە هەرزان ئەیشۆن.

فرەدریک وتی:

– وا ئەمجارە وامان کرد، جارێکی تر وەک تۆ ئەڵێی وای ئەکەین.

سا، ئەمەمان وت و فڕکەمان کرد. کۆڵان کەسی لێ نەبوو بە ڕاکردن چووینە بەر مەغازەی جلەکان چووینە ژوورەوە، کابرا مشتەرییە کیبارەکانی ناسییەوە هەڵسا:

– ئۆو، فەرموون، باقڵ زۆر مەمنوون بوون، وا هاتوون جلی تر بکڕن، ئا کوڕە شاگرد، یەک دوو دەست جلی پیاسە و ڕاو و سواری و بالوو بێنە.

شاگردەکان کەوتنە خۆ، فڕان فڕان و پەیتا پەیتا جلیان هێنا، لەبەر دەممانا کۆمەڵیان کرد، بە ڕاستی من تووڕە بووم وتم:

– ئەم هەرزە چەنەییە چییە ئەیکەن؟ ئێمە ئەڕۆین تۆ جلمان بۆ دێنی.

– ها ها عەفو ئەفەرمووی ڕاست ئەکەی زۆرم قسە کرد، سەرم ئێشاندی، چی بکەین؟ وەزیفە و مەسلەک وای ئەوێ. ئا کوڕە دەستێ جلی سیاحەتیان

بۆ بێنە.

ئینجا فرەدریک تووڕە بوو، بە نیوە شڕەوە وتی:

– کابرا، تۆ ڕاوەستە ئێمە دوو کەلیمە بڵێین، تێ بگە ئینجا ئەوەندە چەنە بدە.

– باشە ئێوە وتتان ئەڕۆین، منیش وتم جلی سیاحەتتان بۆ بێنن.

– جلی چی؟ ڕاوەستە بزانە بۆچی هاتووین.

– ئەوا ڕاوەستام، ئەما دیارە ئەوی بێتە ئەم مەغازەیە بۆ جل دێ.

– خێر بۆ جل نەهاتووین.

– کە وا بێ بۆ جانتەی سیاحەت هاتوون.

– خێر ئەمانە هیچیان نییە، جارێ ئەوا سوێند ئەخۆم تا من لە قسەی خۆم ئەبمەوە، تۆ نقە بکەی دەمت ئەشکێنم.

– خۆ دەمم نابەستی، کە تۆ دەمم بشکێنی لەم مەغازەیە دەرم ئەکەن، کە وا بێ منیش لە پێشەوە حەقی خۆمت لێ ئەسێنم،

فیقەیێکی کرد، هەرچی شاگرد و حەماڵ و ئیشکدار لە مەغازەکەدا بوون کۆبوونەوە، ئینجا ناچار چوومە پێشەوە وتم:

– باوکم لێی مەگرن ئەمشەو فێی لێ هاتووە، ئەما من ناوی ساردم بەسەریا نەکردووە. لێی مەکەن بە ئیقرار، هەر خۆی وای لێ هاتووە.

کابرا وتی:

– بەسەری تۆ هەر ئێستا تەسلیمی پۆلیست ئەکەم، من شاهیدم تۆ براێکی خۆت شێت کردووە. بە خێری خۆم جارێ براکەت چاک ئەکەمەوە، ئەوی فێی لێ بێ ددانی هەڵئەکێشن چاک ئەبێ، ئا (فردیناند) بچۆ وەستای ددانساز بانگ کە.

تێ فکریم، تا دیت لکی لێ ئەبێتەوە، وتم:

– برا خوا هەڵناگرێ، ئێمە غەریبین، ئەمەمان پێ ڕەوا مەبینن.

– هاه، وا وەرە سەر ڕێ، جا بزانم چیت ئەوێ؟

– بە کـورتی و ڕاسـتی، ئێـمـە ئەڕۆین بۆ سـەفـەر، ئەم جـلانـەت پێ ئەفرۆشینەوە.

جارێ پیا هات وتی "چەورتان کـردووە و لکە و ڕچی گـرتووە، ئێمـە جلی کۆن ناکڕین "، بە هەزار حاڵ گوایە بۆ خـۆی لەبەری ئەکا، بە پێنج لیرە و نیـو لێی کـڕین و شـاگـردەکەشـی نارد جلە کـۆنەکانیـان بە دوو قـیـمـەت بۆ هێنایینەوە، لەبەرمـان کرد. هاتین بۆ ئوتێل پارە بدەین، تەمامـان بوو بچین لە ئۆدەکـە کـەمـانـەکەم بێنین، بە بـەردەمی ئۆدەی کـاتبـەکەدا ڕابوردین، بانگی کرد:

– سەروسواڵ کەرینە ئوتێل جێی سواڵ نییە.

وتمان:

– براکـە ئێـمـە خـۆمـان لە ئوتێل بووین پـارەی ئوتێلمـان بە سـەرەوەیە ئەیدەین.

وتی:

– ئەتانەوێ حـەیای ئوتێلەکەمـان بەرن باقڵ ئێوە بە کرێ گیـراون، لە پێش چاوی خـەڵک بڵـێن ئێـمـە لەو ئوتێلە بووین، بـۆ ئەمـەی دوشـمـن پێـمـان بڵێ ئوتێلەکەیان جێی دۆم و قەرەج و سەرسەری و گیرفان برە.

لە قینانا تەمام بوو بڕۆم و پارەکەی نەدەمێ، فرەدریخ وتی:

– توخوا ئەلفرێد با حـەقی کەس نەخۆین، ڕێمـان لەبەرە، تووشی تەگەرە نەبین،

ئینجا چوومە پێشەوە، دەستێکم نا بە پێڵووی خوارووی چاوما، چاوم لێ زەق کردەوە، وتم:

- کوره من ئەلفرێد موللەر ئەفەندیم کە ئیعلانەکەم نووسی،

ئینجا بە دەنگما ناسیمیەوە، قەدەرێ پێ کەنی، وتی:

- خۆ (کارنەواڵ)[155] نییە، بۆچ وا خۆتان کردووە بە مەسخەرە (لاتەڕنە)[156] لێ ئەدەن.

وتم:

- لە باتی لاتەڕنە کەمان لێ ئەدەم، بڵێ کەمانەکەم بۆ بێننە خوارێ، ئەویشە پارەکەت.

پارەکەم دایێ، وتی:

- باوەڕتان ببێ مادام ئێوە ئەوەندە دڵساف و سەرڕاستن، هەمیشە خوا چاکتان بۆ ئەکا، بڕۆن خوا حافیزتان بێ.

## بەشی هەشتەم

ئەوا ئەمانەوێ شەمەندوفەر بدۆزینەوە و لە ویانە دەرچین، لە پیاوێکمان پرسی:

– برادەر ئیستاسیۆنی شەمەندوفەر لە کوێوەیە؟

جارێ کابرا ورد ورد تێمان فکری، وتی:

– شەمەندوفەر چی لێ ئەکەن؟

وتمان:

– سواری شەمەندوفەر ئەبین.

– بۆ کوێ دەچن؟

– بە سەر پێوە تا ناپولی.

– جا خۆ شەمەندوفەر تا ناپولی ناچێ.

– ئەی تا کوێ دەچێت؟

– تا نیوەی ڕێ، لەوێوە سواری ئاقتارمە[۱٥٧] ئەبن.

– ئای.. ئەقتارمە چییە؟

– ئەقتارمە ئەوەیە، ئەم شەمەندوفەرە تا حودوودی ئەوستریا ئەچێ، لەوێ دائەبەزن، ئەچنە حودوودی ئیتاڵیا، لەوێ سواری شەمەندوفەرێکی تر ئەبن.

– سا قوربان کەواتە بە خێری خۆت ڕێگاکەمان نیشان دە، جادەیێک بەو بەرمانەوە بوو وتی:

– ئەو جادە بگرن، ملی ڕێ بەرمەدەن.

حەقیقەت ئەو ڕێیەمان بەرنەدا گەیشتینە بینایێکی گەورە، وتیان ئەمە

ئیستاسیۆنە، سالۆنێکی زۆر گەورەی بوو، فرەدریخ وتی:

– ئەلفرێد، ئەبێ شەمەندوفەرەکە بێتە ئەم سالۆنە، لێرەوە بڕوا.

وتم:

– ڕاست ئەکەی با دانیشین تا دێت.

تەماشامان کرد و زۆر کەس وەک ئێمە دانیشتووە، حەتا لادێییش هاتبوون سواری شەمەندوفەر بن، ئێمە هەر دانیشتین شەمەندوفەرەکە نەهاتە سالۆنەکە، وەک قەیامەت هەڵسابێ، ئەم هەموو خەڵکە بەبەردەممانا لەم قاپییەوە ئەهاتنە ژوورێ، کونێک لە دیوارەکەدا بوو سەریان ئەنایە ئەو کونە پارچەیێک نانی تیریان وەرئەگرت و لە قاپییەکەوە ئەڕۆین، ژنێک بە پەلەپەل بە لامانا ڕابورد تەماشای ئێمەی کرد پێ کەنی و دەسرێکی لێ کەوت هەڵم گرت و بردم دامە دەستی، تەشەکوری کرد، لێم پرسی:

– خانم ئێمە هاتووین سواری شەمەندوفەر بین هێشتا شەمەندوفەر نەهات.

وتی:

– شەمەندوفەر بێتە کوێ؟

– ئەی نایێتە ئەم سالۆنە؟

– چۆن دێتە ئێرە، ئێوەیش لەو قاپیی ئەو بەرەوە بەو قالدیرمە مەرمەڕەدا بچنە خوارێ شەمەندوفەر لەوێ ڕائەوەستێ.

هاتمەوە وتم:

– نامەرد فرەدریخ هەڵسە با ڕاکەین، شەمەندوفەر لە دەرەوەیە.

هەڵسا بە ڕاکردن لە قالدیرمەکان چووینە خوارێ، تێ فکرین، بیست سێ ئۆدەی ئاسن و تەختە پێکەوە بەستراوە و لەسەر ڕەوڕەوەی ئاسن حازر و ئامادە وەستاون، خەڵک سوار ئەبن، ئۆدەیێکی جوانمان هەڵبژارد، چووین

سوار بين قاپيمان كردەوە، دە كەسی تيا بوو، يەكێكيان لێمان تووڕە بوو، وتی:

– لە شەمەندوفەريشدا هەر نارەحەتمان ئەكەن؟ ها ئەوە مارقێک بڕۆن دەرگاكە داخەنەوە.

– ئەفەندی ئێمە سواڵكەر نين، ئەفەندييەكين وەک تۆ، ئێمەش سواری شەمەندوفەر ئەبين.

– ئەمە جێی ئێوە نييە، بگەڕێن جێی خۆتان بدۆزنەوە.

لە قينا توند دەرگام پێوە دا، شەقەقەم لێ هەڵساند، هاتين ئۆدەيێكی جوانترمان دۆزييەوە، دۆشەكی سەر كورسييەكانی هەموو قەديفە بوو، خۆمان هەڵدا بچينە ژوورێ، يەكێک چاكەتێكی ڕەشی لەبەردا، دوگمە زەرد، ئەبريسكايەوە، لێمان تووڕە بوو، وتی:

– كابرايينە، ئەوە چی دەكەن؟ وەرنە ئەملاوە،

من وتم:

– سواری شەمەندوفەر ئەبين.

وتی:

– بليتتان كوا؟

وتم:

– بليت چييە؟

– ئەی بادی هەوا[١٥٨] سوار ئەبن؟

– من سواری ئەرابەی پۆستە بووم، كە دابەزيم پارەم دا، ئێستايش كە دابەزين پارەت ئەدەمێ، مەترسە پارەی جلەكانم نيوەيم پێ ماوە.

پێ كەنی، وتی:

– تا زووە بچن بليت وەرگرن ئەگينە فريا ناكەون، شەمەندوفەر ئەڕوا.

- شوێنی بلیتی نیشان داین، رامان کرد، کونێ بوو، لە پەلەپەلیدا لێکم نەدایەوە تەواو سەری پیا دەچێ یا نا سەرم خوار کردەوە بە هەزار حاڵ سەرم بردە ژوورێ، کەچی کابرایێکی مۆن هات زلەیێکی لێ دام، هاتم سەرم بکێشمە دواوە، پشتی ملم لە شووشەکە کەوت بریندار بوو، سەریشم نەهاتە دەرێ، بانگی فرەدریخم کرد، هات بە هەزار حاڵ سەرم خەلاس بوو، دەستم کرد بە جنێو بە کابرا، کە زانی خوێن لە سەرم هاتووە، دەنگی نەکرد، وتی:

- تۆ چیت ئەوێ؟

- وتم:

- بیلیت، سواری شەمەندوفەر ئەبم.

- بۆ کوێ ئەچی؟

- بۆ ئیتاڵیا.

- پارە بدە زوو کە.

لیرەیێکم دایە وتم:

- دوو کەسین، دوو بلیتمان بدەرێ، بۆ ئیتاڵیا.

- کابرا پێ کەنی وتی:

- بۆ ناپولی دووکەس ١٩٢ مارقە.

- وتم:

- ئەفەندی زۆرە، نەختێ ئیکرام[١٥٩] و تەنزیل[١٦٠].

تێ فکریم، دەرکی کونەکەی داخست و رۆیی، وتی:

- تۆ چاوەڕێی تەنزیلات بە، تا دوو سەعاتی تر.

دوو سەعات بە سەرا رابورد، ئێمە هەروا لەو دالانە دانیشتبووین، روانیمان لەم لا و لەولاوە خەڵک هاتنە بەر کونەکە، وتم موحەققەق وەختی بلیت هاتووە، فرەدریخیشم لەگەڵ خۆم برد چووینە بەر کونەکە، ئەمجارە

نەموێرا سەرم بکەم بە کونا، دەمم نا بە کونەکەوە، تا خوا هێزی دابوومێ بانگم کرد.

- هۆ کابرای زلەوەشێن لە کوێی؟

بلیتچی تەماشای کردین، وتی:

- دیسان شوانە قەحبە بابەکانن، چیتان ئەوێ؟

وتم:

- موسیو ڕجا ئەکەم، ئێمە ئەوەندە پارەمان نییە، نەختێکمان بۆ کەم بکەرەوە.

- برا ئەمە ماڵی باوکم نییە بیبەخشم، بە حیساب بیلیتیان داومێ و پارەم لێ وەرئەگرنەوە.

ئینجا فرەدریخ پاڕایەوە، تێ فکریم لە ژوورەوە دەنگێکی گڕ و قەبە بانگی کرد:

- ئەوانە کێن؟ مۆریس تۆ ئەمەندە بۆچ قسە ئەکەی؟ لەبەر چەنەبازی ناتپەرژێتە سەر وەزیفە، ئەوانە کێن؟ وا گەمارۆویان داوین، دەریان کە.

سا، لە پێشەوە ئەم نەزاکەت و ئیکرامە، لە دواوە یەکێک یەخەی چاکەتەکەی گرتم، ڕای کێشامە دواوە، وام تێ نەوی بە پشتا کەوتم، کە هەڵسامەوە بەری چاوم تاریک بوو، لەداخانا لێی وەرگەڕامەوە زلەیێکم پیا کێشا، ئەویش زلەیێکی لە من دا، فرەدریخ لە دواوە بەربووە وێزەی شل شل کوتای، کابرا هاواری پۆلیسی کرد، ئێمە ڕامان کرد، دیار بوو ئەو پەلە پەلی بوو، بلیتی وەرگرت و بە ڕاکردن چوو بۆ سەر قاڵدرمەکان و خۆی گەیاندە شەمەندوفەر، بەڵام تا ئەم گێرە و کێشەیەیان بەسەرا هات، بەری کیشەکە چۆڵ بوو، چوومەوە لای بیلیت فرۆش، بۆم کرد بە چل مارق، فائیدەی نەبوو، وەک مارمیی دایکی لە سەدو نۆد برابێ پوولێکی کەم نەکرد، توورەش بوو، وتی:

– فیئاتەکەی[١٦١] لە سەری نووسراوە،

وتم:

– جا بەدەست خۆتە، چەندی لێ بنووسی ئەبێ.

وتی:

– تەبع کراوە.

وتم:

– ماکینەکە وا لەبەر دەمتا، دوو تەقەی لێ مەیێنە، با تەقەیێک بێ و پارەکەی کەم بێ.

وتی:

– لا حەولە وەلا.. تووشی چی هاتم.

ئینجا ئاخر سەودا وتم:

– بابە ئەوە پەنجا مارقەکەم بەم پارە تا کوێمان ئەبەی بیلیتی تا ئەوێمان بدەرێ.

کابرا وتی:

– خۆ ئینشائەڵلا سواری کۆڵی من نابی، شەمەندوفەر ئەتانبا، کەوابێ تا قلاکفۆرد ئەڕۆن، لەوێ دادەبەزن، لەوەولا چی دەکەن،

وتم:

– لەوەولا بەپێ ئەڕۆین، ئەگەر ڕێمان بزانیایە ئەم هەموو چەناگەی خۆمانە لە دڵڕەقێکی وەک تۆدا سەرف نەدەکرد.

دەستی برد و مقەوای چوارگۆشەی دەرهێنا و دایە بەر ماکینە، تەقەی لێ هێنا، چاڵی کرد و دایە دەستمان. ئینجا لێم پرسی:

– ئەو شوێنە کە لێی دادەبەزین تا ناپولی زۆری ئەمێنێ یا کەم،

– وتی:

- لە پیادەڕەویندا چۆنن، کابین یا سووکەپێ ئەڕۆن"

- مەپرسە، من چاک ڕادەکەم، حەتتا لە دێیێک کە ژنێکیان بە زۆر لێ مارە کردم و لە تاوا ڕام کرد، هەموو گەنجەکان تۆزی پێیان نەشکاندم.

بەم زەد و خوردە بلیتمان وەرگرت، شوێنی شەمەندوفێرمان ئەزانی، چووینە خوارێ، تەماشامان کرد شەمەندوفێر وەستاوە، بەڵام وەک شەمەندوفێرەکەی بەیانی نییە، فرەدریخ وتی:

- ئەلفرێد، کاشکا بەیانی ئەوەندە گیر و گرفتت نەکردایە، ئەوسا بە سواریی ئەو شەمەندوفێرە جوانانە ئەبووین، ئێستا ئەمانە دەرگایان نییە و سەریان والآیە، ئەگەر باران بباریّ ئەبینە جلەسەگ.

ڕاستی ئەکرد، بە هەر حاڵ چووین دەرگای یەکێکمان کێشایەوە چووینە ژوورەوە، ڕوانیمان چوار دیوارێکی پان و درێژی ئاسن وەک جوین وایە، سا ئێمە سوار بووین و لە ئیستاسیۆنەوە دوو زەلام بە ڕاکردن هاتن بانگیان کرد:

- کورە ئەوە چی دەکەن لەوێ؟ ئێمە سواری شەمەندوفێر بووین، پارەمان پێشەکی داوە، نیشان بەو نیشان یەکێ مقەواییێکی چوارگۆشەمان پێیە، کابرا تەقەی لێ هەڵساندووە، وای بەسەرا تڕیوە هەردوو سەری چاڵ کردووە، یەکێکیان پێ کەنی، ئەویتریان وتی:

- ئەسڵ ئەمە جێی ئێوە نییە، بەڵام ڕاست بۆ ئێوە دانراوە، ئەمە جێی گاگەلە، خۆ ئێوەیش دیارە گان.

هات بە دڵما ئایا گاجووت بە هەرزانتر سوار ئەکەن، یا زەلام. پاشا لێکم دایەوە ئەوان قورسترن، ڕەنگە لەوان زیاتر پارە بسێنن، ئەم مەراقەم لە دڵی خۆما نەهێشت پرسیم:

- هۆ کابرای پێشەکی تووڕە، تو خوا پێم بڵێ ئوجرەتی گاجووت چەندە؟

کابرا پێ کەنی وتی:

– هەر گای دە مارق.

– ئینجا من پێ کەنیم:

– ئافەرین بۆ عەقڵتان، گاجووتێک بە قەد سێ زەلامە، بە دە مارق. ئێمە بیست مارق، باری[١٦٢] هیچ نەبێ وەک لە پێشدا ئێمەتان بە گاجووت دانا، پارەیشمان بە قەدەر گاجووت لێ بسێنن.

– باشە، ئەما ئێوە لە واغۆنی سەرگیراو و قەناپەی قوماشی پیادا درواوا دادەنیشن، ئەو زووتر ئەڕوا.

لەم گفتوگۆیەدا بووین، لە ئستاسیۆنەکەوە کابرایێکی کەتەی ئەستوور هات بە شەمەندوفێرچییەکەی وت:

– موسیۆ ولاخەکان حازرن،

من لە پێش شەمەندوفێرچییەکاندا وتم:

– ولاخی چی؟

کابرا وتی:

– ئەوانەی وەک ئێوە.

– تا کوێیان ئەبەن؟

کابرا بە سەر کە هەندێ لەگەڵ شەمەندوفێرچییەکە دوا و ڕووی کردە ئێمە، وتی:

– چەندتان داوە؟

وتم:

– پەنجا مارق.

– ئەتانەوێ پارەکەتان بسێننەوە و خۆیشتان سوار بن؟

– بەڵێ

– وا من لێرەوە دوو واغۆن گاجووت ئەنێرم، پارەکەیشتان ئەدەمەوە، ئێوە

لەگەڵیانا سوار بن.

ئێمە سەرکەوتین، ڕەومیێ گاجووتیان هێنا یەکەیەکە سەریان خستن، دە گاجووتیان خستە تایێکەوە، بە منیان وت:

– تۆ لای ئەمانە بە، ڕەفیقەکەیشت لەو تای ترا لای ئەوانی تر بێ.

من وتم:

– خێر، ئێمە لێک جوێ نابینەوە، هەر دەبێ بە یەکەوە بین،

کابرا وتی:

– با بەیەکەوە بن بەڵام جار جار بچێ سەریان لێ بدا و بیاندۆشێ و شیرەکانیان بکەین بە پەنیر.

وتم:

– خۆ گوانیان هەیە،

وتی:

– نێرە بیدۆشە.

لە پڕ تێ فکریم، فیکەیێکی توند و تیژ و خرتەخرت لە ژێرمانەوە پەیدا بوو، تومەز شەمەندوفێر کەوتوومتە حەرەکەت. فرەدریخ وتی:

– ئەلفرێد، ئەو دوو وڵاخانەی ئەم ئەرابەیە ئەبەن بە ڕێوە لە کوێن؟

وتم:

– لە ژێرەوەن، ئەمانە بەسەر پشتی ئەوانەوەن.

سا لەم گفتوگۆیەدا بووین، دنیا بەجارێ تاریک بوو، وتم:

– فرەدریک بۆچ وا تاریکە؟

وتی:

– لە ئیستاسیۆن دوور کەوتووینەوە، چرا لە ڕێدا نییە و ئەم واغۆنەش گاجووتی تیایە، چرا بۆ گا ناسووتێنن.

وتم:

- بۆچ ئێمە ئینسان نین؟

- جارێ تۆ خۆت بە کاجووت دایە قەڵەم و بە بیلیتی کاجووت لە واغۆنی کاجووتای، ئیتر چرای چی؟

هەر وا بە تاریکی چاوم ڕێشکە[١٦٣] و پێشکەی ئەکرد. واهیمەم لێ نیشت، وتم:

ئێستا ئەم کاجووتانە بە قۆچ دێنە وێزەم چاوم کوێر ئەکەن.

من لەو ترسەدا ئۆقرەم لێ هەڵگیرا بوو، فرەدریک دیتە شوانیی کرد بوو، نەدەترسا، گۆرانییێکی شوانیی دەست پێ کرد بوو کەیفی ئەکرد، لێی تووڕە بووم، وتم:

- من ئەمە حاڵمە تۆیش گۆرانی ئەڵێی.

- خۆ ئینشائەڵڵا ناگریم، بە بێ پارە سوار بووین، ئەم یۆڵداشانە، کە لە پێش تۆدا ناسیوە، یەک کەوتووینەوە، من گۆرانییان بۆ دەڵێم، تۆیش لەبەر خاتری من کەمانیان بۆ لێ دە.

هێجگاری پێستی سەرم ئاوسا، وتم:

- خوا بتگرێ بۆنم پێوە دەکەن، هاکا سوارم بوون.

فرەدریک پێ کەنی، وتی:

- بە خوا ئەمانە لە پیاوی سپڵە باشترن، بێ زەرەرن،

وتم:

- ئەم فەلسەفەیەت هەڵگرە بۆ شوێنێکی تر، ئێستا[١٦٤] چارەمان چییە؟

وتی:

- من چارە نازانم.

وتم:

- بالێره خۆمان فڕێ دەینە خوارێ، با بە پێیان بڕۆین.

وتی:

- ملمان ئەشکێ.

وتم:

- لە جێیێکی نزم بازدەین.

وتی:

- جێی نزم کوا.

خـواوڕاسـتـان لەودەمـەدا شـەمـەندوفـێـر لە بەرەوژێـریـیـێـک کـەوتە لـەنگە، هێواش ئەڕۆیین، زۆرم لە فرەدریخ کرد خۆمان فڕێ دایە خوارێ، ئەوهاواری کرد:

- باوکەڕۆ پشتم شکا،

منیش بانگم کرد:

- سێبەندەم[١٦٥] وەرگەڕا.

قەدەرێ بە گازی پشتا کەوتین، کە هەڵسایین دنیا تاریک و نووتەک،

- جا چی بکەین؟

- چوزانم.

- ڕاوەستین تا شەمەندوفەری پیاو دێت سوار ئەبین.

- ئەوا گریمان شەمەندوفەر هات، چۆن لێرە ڕائەوەستێ؟

- باشـە تۆ پـەنجـا مـارقت داوە، ئـیـتر هـەمـوو شـەمـەندوفـەری دنـیـا لە ژێر ئەمری تۆدایە؟ جارێ با ئاوەدانییێک بدۆزینەوە، پەنجکێ[١٦٦] نانمان دەست کەوێ، ئینجا سواری شەمەندوفەر بین.

- ئێمە کە بە شوێن ئاواییدا بگەڕێین جارێکی تر ئەم خەتە نادۆزینەوە.

- ئەی چی بکەین، هەر لێرەیش دانیشین لە برسا ئەمرین.

- من تەدبیرێکی ترم دۆزیوەتەوە، ئەو دێیەی پیا دەڕۆین نیشانەی بکەین.

- چۆنی نیــشـــان بکەین، بەرد بچنینەوە هـەر لە سێ هەنگاوا بـەردێ دابنێین، کە گەڕاینەوە لێمان گوم نابێ.

هاتین گـیـرفـان و شـەپقـەمـان پڕ کـرد لە بـەرد، هەر لە سێ هـەنگاوا[١٦٧] بەردێکمـان دانا. سـەعـاتێ بەڕێدا ڕۆیین بـەرد بڕایەوە و[١٦٨] گـەیشـتـووینە جادەیێک بەردمان دەست نەکەوت جا چی بکەین، فرەدریخ وتی:

- با ڕوو بکەینە خوا، نەختێ بپاڕێینەوە و ڕووەو قودوس دانیشین.

فرەدریک لە مەقامی موناجاتی کڵێسا بە دەنگێکی سۆزناکەوە دەستی پێ کـرد. هاتمە جـۆشـێک کـوڵی گـریانم نەدەنیـشـتـەوە. لە نـاکـاوە، دەنگی سـەگـوەڕێک پەیدا بـوو، هەردووکـمـان ڕاپەڕین، ڕوومـان کـردە سـەمـتی[١٦٩] سـەگـوەڕەکـە، زۆر نـەڕۆیین لە ملەیەک سـەر کـەوتین ڕووناکـاییی دێیـێک دەرکەوت، هـەر ئەوەندەمان خۆشبوو تا گـەیینە دێ سەگەل گەمارووی داین، فرەدریک هاواری کرد:

- ئای ئەلفرێد بمگەرێ من زۆر لە سەگ ئەترسم.

وتم:

- گوڕت بێ لەو گاجووتە زلانە نەدەترسای لەم سەگە وردانە دەترسی؟

وتی:

- من بە منداڵی سەگ گەستوومی، زۆری لێ دەترسم،

هاوارمـان کردە دێ، خۆمـان کوتابووە دەرگـای خـانووێکەوە، دیتـە سەگەل لە پێشـەوە پەلاماری ئەداین، ئێمـە لە ترسـا خۆمان لە قـاپییەکە توند کرد، لە پڕ قـاپی ترازا هـەردووکـمـان بەپشـتـا کـەوتینە ئەودیو دەرگاکەوە، پیـاوێک بە هەڵەداوان هات تێی خوڕین، وتی:

- کورە کێن؟

وتم:

- براکە غەریبین ڕێمان کەوتە ئەم دێیە، سەگەل گەمارووی داین لە تاوا خۆمان کوتاوەتە ئێرە.

- قەدەرێ تەماشای کردین وتی:

- من ئێوە بە پیاوخراپ نازانم فەرموون،

دەرگای کۆلانی داخست و پێشمان کەوت بردینییە قاتی سەرەوە، قاتی سەرەوە زینهار وا مەزانن قاتی دووەمی شاتۆکەی میقائیلللا بوو، دوو سەد قالدیرمە سەرکەوتین، دالانێکی تەسک بوو، لە دالان تێ پەڕین لە دەرگایێکی دا، بانگی کرد:

- لیزا، لیزا هەڵسە میوانمان هات.

- ئێمەی بردە ئۆدەییکی تر قەناپەیێکی حەسیر و دۆلابێکی تەختە، باقەیێک کتێبی لەسەر هەڵچنرابوو، گۆزەییکی کۆنی قوڵپ شکاو و گڵێنەیێک[١٧٠]، چرایێکی نەوت لەبەر چراکە تەماشای سەر و گوێلاکێکی خاوەند ماڵەکەم کرد، نە کورت نە درێژێکی پەڕە مل ئەستوور، وەک دەروێش پرچی بەرداوەتەوە قەڵەندەرێکی دەم بە پێکەنین، پانتۆڵێکی ڕەش لە پێدا، جبەیێکی درێژ لەبەردا هەڵدەسووڕێ و خزمەت ئەکا، ئێمەی لەسەر قەنەفەکە دانا وتی:

- دیارە زۆر برسیتانە، هەر ئێستا پایە[١٧١] نانتان بۆ دێنێ،

ئێمەیش پێشەکی سوپاسمان کرد، بەڵام من جارێ لە پێشەوە لێم بوو بە مەراق، ئایا ئەم پیاوە کەوا ئەیەوێ میوانداری بکا کێیە؟ وتم:

- بێ قەیدی نەبێ جەنابتان کێن؟

- من ڕاهیبی ئەم دێیەم.

- منیش وا تێ گەییوم.

- بە چیا زانیبووت؟

- پرچت درێژە و زگت زلە.

- برادەر کەوابێ لە زیرەکیدا بەشی کەست نەهێشتووەتەوە.

- تۆیش زیرەکی کە زانیت لە عاقڵیدا بەشی ڕەفیقەکەم نەداوە.

زۆری پێ نەچوو، دەرگا کرایەوە ئافرەتێکی کەڵەگەتی چل چل و پێنجی، مانتۆیێکی[۱۷۲] درێژی لەبەردایە، هێشتا چاوی ئەگڵۆفی هاتە ژوورەوە، وتی:

- حەو.. ئەمانە کێن؟

ڕاهیب وتی:

- ڕێبوارن، ئەم شەو ڕێیان کەوتووەتە ئەم دێیە، سەگەل گەمارووی دابوون، خۆیان کوتاوەتە ئێرە، زۆریان برسییە، زوو پارووێ نانیان بۆ عیلاج کە،

- شێخۆن ئازانە ڕۆیی، ئینجا ڕاهیب ڕووی کردە ئێمە، پرسیی:

- ئێوە بۆ کوێ ئەچن؟

- بۆ ناپولی.

- ناپولی کوێیە؟

- لە ئیتاڵیا.

- ناپولی لە کوێ و ئێرە لە کوێ؟ زۆر لێک دوورن.

هەر چیمان بەسەر هاتبوو بۆم گێڕانەوە، وتم:

- لە شەمەندوفەر خۆمان فڕێ دایە خوارەوە،

ڕاهیب حەپەسا، وتی:

- ئێوە لە شەمەندوفەر خۆتان فڕێ داوەتە خوارەوە، چۆن ماون نەمردوون؟

وتم:

– وا ئەبینی ماوین، رووحمان نەچووە بەبەر کەسا، وا هاتووینە ماڵی ئێوە، ئێوەیش ماڵەکەتان زۆر وێرانە، ئێمە راهیبێکمان بوو ماڵێکی خۆش و پاک و تەمیز، تۆ دیارە ژنەکەت تەمەڵە و ماڵەکەت پیس و پۆخڵە.

راهیب وتی:

– جارێ تا نانتان ئەداتێ پیرێژنمان لێ توورە مەکەن.

لەم قسانەدا بووین ژنە هاتە ژوورەوە، سینیێکی بە دەستەوە، داینا، وتی:

– فەرموون.

وتم:

– خولقی[173] پێ ناوێ.

فرەدریک پەلاماری نانی دا، نانێکی هەڵگرت تێی بەربوو، نەیپەرژایە سەر ئەمە بڕوانێ سینییەکە چیی تری لەسەرە، جارێ هەرچاوی نانەکەی دی، کەچی پەنیر و باسدیرمە و هەشت نۆ هێلکەی کوڵاویشی لەسەر بوو، ئێمە شێتانە نانمان ئەخوارد و ئافرەتەکە هیچ پێمان پێ ئەکەنی، لێ بووینەوە، هەڵسواینە پێ. راهیب وتی:

– ئۆغور بێ؟

وتم:

– رێبوار کە رێی لەبەر بوو چاری رۆیینە.

وتی:

– بەم نیوەشەوە چۆن بێڵم بڕۆن

– ماڵتان ئاوابێ، نارەحەتمان کردن، ئیتر بەسە.

– خێر ئێمە نارەحەت نابین.

لەو سەردەمەدا ژنە راهیبەکە هاتە ژوورەوە وتی:

– ئەوە میوانەکانمان خەریکی چین؟

ڕاهیب وتی:

– خەریکن بڕۆن.

– بۆچی تۆ پێڵی بەم نیوەشەوە بڕۆن، هەر سەگ ئەیانخوا.

– من زۆرم پێ وتن.

– تۆ نازانی خوڵکی میوان بکەی، ئەگەر ئەتەوێ نەڕۆن، سێ بە سێ تەڵاق بخۆ بڵێ نابێ بڕۆن.

کە وامان زانی، ناچار ماینەوە، حەزیشمان ئەکرد. ڕاهیبژن چوو دوو دەست نوێنی بۆ هێناین جێی بۆ داخستین، وتی:

– ئینجا تێر بنوون، خەوی خێرتان بێ.

– ئەوان ڕۆیین، بە فرەدریخم وت: برادەر ئاگات لێیە، ئەم ماڵە چەند چاکن، با کە ڕۆیین بەخششێکیان بدەینێ، وتی:

– های های زۆر چاکە.

بە هەردووکمان حیسابمان کرد، دوو مارق و دە فنیک بوو، بە خواردن و نووستن و هەموو چشتێکەوە، جوێم کردەوە نامە ژێر سەرم کە بەیانی لە بیرم نەچێ بەیانی هەستاین، هاتم نوێنەکان هەڵگرم لێفە و دۆشەکم هەڵگرت، مێزێکی شڕی کۆن، کە ڕاهیب کتێبی خستبووە سەر، نامە سەر مێز، نوێن و مێز بەلادا هاتن، کتێب پەرش و بڵاو بووەوە، مێز کەوت بەسەر گۆزەدا، گۆزە شکا، ئاو ڕژا، ژوور بوو بە مەرەزە، بە گرمەی نوێن ڕووخانەوە هاتن، هیچ دەنگیان نەکرد. ئینجا لە خەجاڵەتیدا هەوڵی ئەوەم بوو زوو دەرباز بین، بەبێدەنگی پارەکەم کردە دەستی ڕاهیبەوە وتم:

– بە دوعا ماڵ ئاوا.

ڕاهیب توند دەستی گرتم، وتی:

– ئەوە چییە؟

- وتم:

- خۆ سێبەری بن ئەشکەوت نییە، ئەوە حەقی خواردن و نووستن، هێشتا حەقی گۆزە و تەڕی ماوە، وتی:

ڕۆڵە عەقڵت بێ قەد ڕاهیب پارە وەرئەگرێ؟

وتم:

- حەو، ڕاهیبەکەی ئێمە لە مردوویشی ئەسەند چە جای زیندوو، بۆیە وا دەوڵەمەند بوو،

وتی:

- ڕۆڵە ئەوە ڕاهیب نییە.

ئینجا بە پەلە پەل هاتینە دەرێ، لەوێ دەرچووین، ڕۆژ بوو سەگمان پێ نەوەڕی وتم:

- فرەدریخ وا ئەم ڕاهیبە پارەی لێ وەرنەگرتین، کە میقائیلام هێنا و دەوڵەمەند بووم، وا چاکە پارەی بۆ بنێرم.

وتی:

- زۆر باشە.

- وتم:

- کە تۆ بە مەسلەحەتی ئەزانی، با بگەڕێینەوە خەبەری بدەمێ کە دەوڵەمەند بووم، پارەی بۆ ئەنێرم.

فرەدریخ وتی:

- چۆن ڕووت دێ بچیتەوە، تۆ ئەو کەتنەت گێڕا، با بڕۆین.. ئەوە لە هەمووی خراپتر لێمان نەپرسی شەمەندوفەر لە کوێوەیە، ئێستا ڕوو بکەینە کوێ؟ کە ڕوانیمان دوو کەس باغ ئەکێڵن، بانگم لێ کردن:

- براگەل ئیستاسیۆنی شەمەندوفەر لە کوێوەیە،

وتیان:

– بە دەستە ڕاستا بڕۆن شەقامە، بە شەقاما بڕۆن دێیێکتان دێتە پێش ئیستاسیۆنی شەمەندوفەری لێیە.

– زۆر مەمنوون بووم، گیرفانی بەرۆکم گەڕام، بیلیتی شەمەندوفەرەکەی تیا بوو لە خۆشیانا بە هەڵپەڕکێ ڕۆیین، بیست دەقیقەی نەخایاند گەیشتینە دێ، ئیستاسیۆنێکی خنجیلە، چووین لە داڵانەکەیا شەمەندوفەر چییێکمان چاوپێ کەوت، لێمان پرسی:

– شەمەندوفەر کەی دێت؟

– بۆ کوێ دەچن؟

– بۆ ئیتاڵیا

– ئەبێ لە ڕێگا ئاقتارمە بن.

– ئۆخ دیسان ئاقتارمە.

– ها، وا، شەمەندوفەر هات.

خۆی ڕۆی و شەمەندوفەر هات، ڕاوەستاین تا خەڵک دابەزین، ئێمەیش هەڵمان کوتایە پێشەوە، قاپیێکمان هاتە پێش، تەمامان بوو سوار بین، لە ژوورەوە دەرگاکەیان لێ پێوە داین چووینە کۆمپارتمانێکی[١٧٤] تر سەرکەوتین، کابرایێک لێمان ڕاست بووەوە، زلەیێکی لە فرەدریک دا، ئەویش زلەیێکی لەودا منیش ڕاست بوومەوە، بە هەر دووکمان زۆر چاک لێمان دا شریتێک بە ژوور سەریەوە بوو ڕای وەشاند دەنگی زیل[١٧٥] پەیدا بوو، شەمەندوفەرچی هات جارێ پرسیی:

– ئێوە کێن؟ و بۆ کوێ دەچن؟

من وتم:

– بۆ ئیتاڵیا دەچین.

داوای بیلیتی کرد، وتم:

– بیلیتمان هەیە سواری ئەرابەی گابووین، جێگەمان ناخۆش بوو، خۆمان فڕێ دایە خوارێ،

– بیلیتەکەمان دایە تەماشای پشتەکەی کرد، وتی:

– ئەمە موددەتی تێ پەڕیوە،

– وتم:

– موددەت مەعنای چی؟ بۆچ ئەمە میوەیە وەقتی بەسەرچووبێ،

وتی:

– چەنەبازیی پێ ناوێ یاڵڵا خوارێ ترەن حەرەکەت ئەکا.

بە زۆر کردینییە خوارێ. ئێمە دەستمان کرد بە پرت و بۆڵ. مەئمووریک لەولاوە هات، وتی:

– ئەوە بۆڵەبۆڵی چیتە؟

وتم:

– بیلیتم پێیە و لە شەمەندوفەریان دابەزاندم.

وتی:

– ئا بزانم بیلیتەکەت.

پیشانم دا وتی:

– بەسەر چووە، ئێوە یەک دەفعە بەم بیلیتە سواربوون و دابەزیون.

وتم:

– خۆ ئێمە لە محەتە دانەبەزیوین.

– ئەی لە کوێ؟

– لەڕێ دابەزین، خوێنمان لەسەر شەمەندوفەرە، وەقت بوو هەردووکمان ئەستۆمان وردبێ بازمان دایە خوارەوە.

– شەمەندوفەر بەڕێوە بوو؟

– ئەرێ وەڵڵا ئەڕۆیی، بەڵام تووشی بەرە و ژوورێک هاتبــوو زۆر مــاندوو بوو، خەریک بوو وچان بدا، ئێمەیش خۆمان خستە خوارێ.

سا من وام گوت توند یەقەی گرتم، بردمیە ئۆدەیێک سێ چوار کەسی لێ بوو، لەوێ وتی:

– ئەمانە لە شەمەندوفەر بازیان داوەتە خوارێ.

پیاوێکی ڕیشداریان تیا بوو وتی:

– جەزایان لێ بسێنن.

وتم:

– ئێوە ئەبێ جەزا بە ئێمە بدەن، ئەوی شەمەندوفەری ئێوە بە ئێمەی کرد کەس بە کەسی ناکا..

کە تێ فکرین، بە خواهش پارە نادەین، پۆلیسیان بانگ کرد بە زۆر بیست مارقیان لێ سەندین. فرەدریخ تووڕە بوو خراپ. وتم:

– بۆچ تووڕە بووی؟

وتی:

– لە تۆ تووڕە بووم، تۆ چیت بەســەر ئەوەندە قسە کردنەوە هەیە لە هەموو شـوێنێک ئەڵێی بازمـان دا، وەکوو قەڵای دمدمت گرتبێ، ئەگەر تۆ نەتوتایە، کێ ئەیزانی؟

– چۆن؟ کێ ئەیزانی؟ خۆمان خەبەرمان نەدایێ جەزای زۆرتر بوو، ئەوسا خـاوەند گـاجـووتەکـان شکاتیـان ئەکرد، ئەیانگوت گـاجـووتەکـانیـان بەجێ هێشتوون.

– بەم عەقڵەوە ئەبی بە مێردی میقائیلـلا. ئەگەر تۆ خۆت ئاشکرا نەکەی، کێ تۆ ئەناسێ.

– قسەی قۆڕ جەنابی ئەلفرێد موللەر ئەفەندی، کێ نایناسێ.

– های ئەلفرێد، چاڵم[١٧٦] بەسەر منیشا؟

که تێ فکریم، حەقیەتی ئاشتم کردەوە، هاتین لە گۆشەیێکەوە دانیشتین، ماندوو مردوو، بیری حاڵی خۆم کردەوە، ئیتر پارەیشم نەمابوو، چاوم لێک نا، لە سەردا بە حاڵی سەرگوزەشتەی خۆما هاتم، منداڵێکی لادێیی، بێ غەم لە دێیێکی دەرکەنار[١٧٧]، هەوایێکی ساف، زەوییەکانمان نزیک ئاوایی، ئەرکێکی وام بەسەرەوە نەبوو، بە خۆڕایی باوکم دەری کردم، من نەبێ کێ باوک دەری کردووە. هاتم لە خزمەت میقائیللادا چەند خۆشم ڕابوارد، زەمانە وایە، هێشتا لەزەتم لە میقائیللا نەدیبوو ئەو سەفەرەمان هاتەپێش، ئەو کەوتنە خوارەوە، ئەو ترسە، دوای ئەوە ئەو هەموو فەلاکەتە ئێستایش ئەم بێ پارەییە، خەمم لێ نیشت، کەمانە خەمڕەوێنەکەم دەرهێنا، فرەدریخ نووستبوو، من دەستم کرد بە کەمان لێدان، ئەویش خەبەری بووەوە، بەستەیێکی هۆغۆ (بێکەسی) من لێرەدا ئەویش لەسەر کەمانەکە وتی، هەموو خەڵکی ئیستاسیۆنەکەمان لێ کۆبوونەوە، هەروا پارەیان بۆ فڕێ ئەدان، شەپقەکەم گرتبووەوە، پڕیان کرد لە پارە، کابرای شەمەندوفەرچی کە جەزای لێ سەندبووین، هات و وتی:

– حەیفە جەزامان لە ئێوە سەندووە،

بەقەد جەزاکە پارەی کردە شەپقەکەمەوە. دوایی بردمە بەردەمی وتم:

– بۆم بژمێرە، بزانە بەم پارەیە دووکەس ئەگەیێنێتە ناپولی.

ژماردی وتی:

– بەشی بلیتی دووکەس زیاترە، جگە لە پارەی بلیت، بیست و پێنج مارقەتان زیادە.

وتم:

– ئەویش بۆ جەزای شەمەندوفەرچیی جێیێکی تر، هەمووتان پێمان فێرن جەزامان لێ بستێنن،

دەستیان کرد بە پێکەنین، موساعەدەیان کرد، بلیتیان داینێ وتم:

– ئامان ئێستا مەیبرە تا شەمەندوفەر دێت، وادەی بەسەر ئەچێ،

وتی:

– نا نا نایەڵین بەسەرچێ.

– دانیشتین تا شەمەندوفەر هات، شەف ترمن[178] خۆی هات، بانگی کردین، بردینییە واغۆنێکەوە، زۆرمان پێ خۆش بوو، وتم:

– فرەدریخ، وا ئەمجارە بە ڕاست لە شەمەندوفەردایـن، ئەچین بۆ ناپۆلی،

من هێشتا خۆشی خۆشیم تەواو نەبوو، قاپی کرایەوە ژن و پیاوێک هاتنە ژوورەوە، تەماشای ئێمەیان کرد، ژنەکە سەری نایە بناگوێی پیاوەکە و پێ کەنی، منیش وتم:

– فرەدریخ، سەیری ئەم مەسخەرەیەکەن.

ئەموستم بۆ ڕاهێشت و پێ کەنیم، پیاوەکە تووڕە بوو وتی:

– ئێوە بێ تەربییەن، پێمان پێ دەکەنن.

– بێعاری چاک ئێوەن، کە لە پێشدا ژنەکەت پێ کەنی.

کابرا کە زانیی لە پێش چاوی ژنەکەی لێ ئەدرێ، خوستی[179] لە خۆی بڕی، ئیتر دەنگی نەکرد. فرەدریخیش وتی:

ئەلفرێد تۆیش بەسەریا مەچۆ، وازمان لە یەک هێنا، ئەوان لە پەڕێکەوە دانیشتن، ئێمەیش لە پەڕێکی ترەوە، ئافرەتەکە بە مێردەکەی وت:

– تۆ لە دەرەوە هێندەت پەلەپەل لێ کردم نەتهێشت هیچ بخۆم، وا ئێستا برسیم.

مێردەکە لە ڕەفەی شەمەندوفەرەکە سەبەتەیێکی داگرت پڕی بوو لە پەنیر و پاسدیرمە و سجووق و خواردەمەنی. ئافرەتەکە مڵچەمڵچ دەستی کرد بە خواردن، ئەوسایە بیرمان[180] کەوتەوە کە ئێمە لە دوێنێ ئێوارەوە هیچمان نەخواردووە. سەرم نایە بناگوێی فرەدریک وتم:

– با داوای نانیان لێ بکەم.

وتی:

– هیچ هەڵناگرێ، ئێمە لە پێشەوە شەڕێکی وامان دامەزران ئیتر ڕوومان نەیێ لەگەڵ یەکتری بدوێین.

– ئینجا چییە، پارەیان ئەدەینێ.

– باشە خۆ ئەوان لە شەمەندوفەردا دووکانی نانەوایان دانەناوە.

– ئەی ئەگەر بە پارە نەیان دا، بە زۆر لێیان ئەستێنین؟

– ئاها سەری بێکەسە

– ئەرێ وەڵڵا برسـیـەتی ڕەنگی هاریی پێـوەیە، ناوەسـتم، ئیـتـر هـیچ نەوەستام چوومە بەردەمیان،

– پیاوەکە بە مۆنییەکەوە لێم مۆڕ بووەوە، وتم:

– ڕاوەسـتـە تووڕە مـەبە، دوو قـسـەت پێ دەڵێم، ئەگـەر بە دڵت نەبوو، ئەتوانی تووڕە بی. با وجوود[181] لە تووڕەبوونیشدا زەرەر ئەکەی.

– دەستم کرد بە گیرفانما هەندێ پارەم دەرهێنا:

– ئێمـە لە مـاڵی خۆمـانەوە نەهاتووین، لە بیـریشـمـان چوو لە دەرەوە نان بکڕین، وەرن پیاوی چاک بە بایی ئەم پارانە نانمان بدەرێ،

– ژنەکە پێ کەنی وتی:

– دیارە ئەمانە سافیلکەن، نانیان بدەرێ،

دوو نانی حـۆقـقـەیی[182] بە بتـوونی[183] دامێ و پارەیشی لێ وەرنەگـرتم، هێشتا پاروومەکەمان لە دەما بوو، کابرایێکی درێژی شەپقە چوارگۆێ دوگمە سپی هاتە ژوورەوە، گازێکی کونکەرەی بە دەستەوە بوو، داوای بلیتی کرد، لە پێشـدا ژن و مێردەکەی کە نانیـان دابووینێ لە پێشەوە بـوون بلیتەکانی وەرگـرت دایە بەردەمی گـازەکە، کـرتەیێکی هێنا کـونی کـرد، داوای بلیـتی ئێمەی کرد، وتم:

– جارێ ڕاوەستە دەمم گیراوە،

خەریک بوو دەست بکا بە دەمما وتم:

– ئەوە چی دەکەی؟

وتی:

– وام زانی بلیتەکەت لە دەمتایە وا ئەڵێی دەمم گیراوە.

وتم:

– وام زانی تیکەکەم لە دەمم ئەفڕێنی، کە ئەڵێن سواڵکەری گرانی تیکە لە دەمم ئەفڕێنێ. باوجوود کە نانەکەیش هی خۆمان نەبوو، ئەو ئافرەتە بە خێری خۆی دابووینێ،

وتی:

– دەک خێری نەنووسێ، زووکە بیلیت با زیاتر پریشکی ئێوەم پیا هەڵنەپەڕی.

بیلیتم دایێ ئەویشی کون کرد، خەریک بووم یەخەی بگرم بۆچی کونی کرد؟ زوو قاپیی کردەوە بازی دایە خوارەوە ڕوانیم نەچووبووە خوارەوە، منیش دەرگام کردەوە بزانم لە کوێوە ڕۆیی، مێردی ژنەکە وتی:

– شەمەندوفەر لە ڕۆییندایە قاپی بکەیتەوە جەزات لێ ئەستێنن،

وتم:

– ئەی بۆچ لەوی ناسێنن.

وتی:

– ئەو شەمەندوفەرچییە.

لەگەڵ کابرا کەوتینە گفتوگۆ لێی پرسیم:

– تۆ بۆچ ئەچی بۆ ناپولی؟

لە پێش منا فرەدریخ وتی:

– لە شوێن دەزگیرانەکەی ئەگەڕێ لێی گوم بووە.

لەولاوە ژنە دیسان پێ کەنی وتی:

- چۆن دەستگیران گوم ئەبێ؟

من توورە بووم، مێردەکەی وتی:

- لێی مەگرە منداڵە.

- وتم:

- ئۆف.. بە خوا منداڵی چاکە بە خوا چلە و تەوقی ملە ئینجا ژنە ئاگری تێ بەربوو، کەفی چەند نەیئەزانی چۆن جنێو بدا وتی:

- ئەوە مێردەکەم لێی پرسە هێشتا حەوت مانگە شووم کردووە منداڵیشمان نەبووە.

- وتم:

- چەندەمین شووتە؟

- تف لە تۆ خۆ کچ بووم، نیهایەت[184] بە منداڵی بنم پڕابوو، ڕووسووریم نەمابوو.

- ها، ئەگەر کچ بوویتایە ڕووسووریت ئەبوو، با کچیش بوویی، لە دێی ئێمە کچێ هەر وا مابووەوە بە چل ساڵ شووی کرد لە تۆیش جوانتر بوو.

ئیتر ئافرەت دەستی کرد بە گریان، ئەیگوت:

- ئەمەم بۆ بکوژە.

وتم:

- خوێنی ماڵی باوکت زۆرە.

وتی:

- لە پارەی دارایی خۆم[185] خوێنی ئەدەم،

ئێمە لەم شەڕە دەندووکەدا بووین "ترەن" گەیییە ئیستاسیۆن[186]، پرسیم:

- ئەمە ناپولییە؟

وتیان:

– بۆ ناپولی شەو و ڕۆژێکتان ماوە.

لەو ئانەدا تێ فکریم کـــابرایێکی تەنگە ئەســــتــــوور هـاتە ژووریّ لە قەسابەکەی ئەکرد کە لە ویانە گاجووتەکانی هێنابووە شەمەندوفەر، وتم:

– یاخوا بەخێر بێی، گاجووتەکان بە سەلامەت گەیشتنە بەرەوە؟ کابرا واقی وڕما وتی:

– گاجووتی چی؟

– ها، گاجووتەکانی کە لە ویانە سواری شەمەندوفەرت کردن.

– تۆ من بە کێ ئەزانی؟

– بە قەسابەکەی ئاشنای خۆمان.

– بە چیـا ئەزانی من قەسابم؟

– بە سەر و گوێلاکتا

– تۆ منت نەناسی، بەڵام من ئێوەم ناسی

– ئێمە کێین؟

– دیارە کە دۆمن

سا ئەو ئەم قسەیەی لە دەم ترازا، ژنەکە لەو لاوە دایە قاقای پێکەنین و ڕووی کردە کابرای قەساب وتی:

– ئای بە قوربانی دەمت بم، ئەوا هیچم لە دڵا نەما، من ئێستا نەمئەوێرا بیڵێم، وا شوکور تۆ وتت.

جارێ وازم لە قەساب هێنا، پێم گوت:

– ئاغای قەساب تۆ چەوتە و شیلەی[۱۸۷] ئەم ئافرەتە بگرە، بە دەم و شیلە حەیوان ئەناسی، بزانە لە چل ساڵ بەرەوژوورتر نییە،

لەولاوە مێردی ئافرەتەکە ڕاست بووەوە، لە قینا ئەلەرزی، وتی:

– ئێوه گەیشتنه ڕادەیێک گاڵته به خانمی من بکەن، سا ڕاوەستن بزانن ئێستا پێ نیشانتان ئەدەم[188]. فرەدریخ سەری نایه بناگوێم وتی:

– ئەلفرێد، ئەم کابرای قەسابه ناتوانێ له شوێنی خۆی بجووڵێ، ئافرەتیش هیچی له دەست نایێ، با هەستم تێر و پڕی بکوتم،

وتم:

– فرەدریخ، نان و نمەکمان کردووه، لێیان گەڕێ.

به کابرام گوت:

– ئێمه نانی ئێوەمان خوارد، ئەگینه ئەمزانی چۆن داتئەنێمەوه، تۆ به ژنت بڵێ بێدەنگ دانیشێ، ئێمەیش هیچ ناڵێین.

مێردی ژنه دانیشتەوه، ئینجا نۆره هاته سەر قەساب، وتم:

– توخوا به ڕاست گاجووتەکان هی تۆ نەبوون؟

– تۆ جارێ پێم بڵێ ئەسڵت کوێندەریت.

– ئەڵمانی.

– ئەڵمانیا له چه شوێنێکی؟

– باویراچه دێیێک؟

– دەمێکه هاتووم، وا ساڵی به سەرا تێ وەرئەگەڕێتەوه، ناوی دێکەی خۆمانم له بیر چووەتەوه، ئەی تۆ به ڕاست کێی؟

– ئەوقاتم.

– ئەوا ناوێکم بیست[189] که تا ئێستا نەمبیستووه.

– ئەوقات بەری چه دارێکه.

– بەری خوێندن و عیلمی حوقووقه.

– خۆ منیش به قەد تۆم خوێندووه، بۆچ نازانم ئەوقات چییه.

لەم گفتوگۆی ئێمەدا دیسان ژنەکه هەڵی دایێ وتی:

- تۆ چە تاقەتێکت هەیە ئەمەندە لەگەڵ ئەمانە ئەدوێی؟

تەمام بوو جوابی بدەمەوە، کۆنە قەسابی تازە ئەوقات بە دزییەوە وتی:

- تو خوا دەنگ مەکە ئافرەتە.

- منیش بە قسەم کرد، بەم بەزم و ڕەزمە نزیک ئیستاسیۆن کەوتبووینەوە. ڕوانیم ئافرەت زوڵفی خۆی بە شانە ئەکا و خۆی ڕێک ئەخا و پیاوەکەیش جانتا حازر ئەکا، گەیشتینە ئیستاسیۆن، دابەزین، دوعاخوازییان نەکرد، منیش نەمکردە نامەردی، دوو مارقم دەرهێنا و هاویشتم دام بە سەر و سووڕەتی ئافرەتەکەدا، بانگم کرد:

- ئەوە پارەی نانەکەیە کە لێرە پێتان فرۆشتووین، با لای خەڵک نەڵێن موللەر ئەفەندی پارەی نانەکەی نەدا.

هەرچی خەڵکی لە ئیستاسیۆنەکە ڕاوەستا بوون دایانە قاقای پێکەنین، کابرا هار بوو، گەڕایە دواوە تا خوا هێزی دابوو، گۆچانێکی ئاراستەی کردم، من خۆم کێشایە دواوە، گۆچانم بەر نەکەوت. خۆی بەدەمەوە کەوت، شەمەندوفەرچییەکان قاچیان گرت ڕایان کێشایە دواوە، شەمەندوفەریش کەوتە حەرەکەت، هەڵسابووەوە، بە گۆچانەکەیەوە بە شوێن شەمەندوفەرەکەدا ڕای ئەکرد و خەڵک پێی پێ دەکەنی. ئەوقاتیش قەدەرێ پێ کەنی، ئیتر نەختێ بێدەنگ ڕامان بوارد، ئەوقاتیش لە ئیستاسیۆنێکی تر دابەزی، ماینەوە خۆمان، وتم:

- فرەدریخ، تو خوا با بۆ خۆمان بەزمێ بگرین.

دەستم دایە کەمان، ئاقۆردم کرد[190] من لێم دا فرەدریخ وتی. لەم دیو و لەو دیوەوە زۆر ئافەرینیان کردین، کەچی لە پشتمانەوە، کابرایێکی منگن بانگی کرد:

- بەم شەوە چە ڕەزالەتێکە[191]، خەوتان لە ژنەکەم هەراسان کرد...

لە پێشمانەوە دەستەیێ کوڕگەل بە وۆحە وۆحە بە کابرایان گوت:

– ژن ئەگەر ژن بێ چۆن حەز لەم ئاهەنگە ناکا؟ بەڵام وا دیارە تۆ دڵت پیسە، ئەڵێی ئەک ژنەکەم عاشقی ئەم کوڕانە ببێ منگن.

– ئەم بێشەرم و[192] حەیایانە کێن؟ من ئافرەتم لەلایە ئەوان تەحقیرم ئەکەن.

ئیتر لەولاوە (لە دوو لاوە) بوو بە شەڕە جوێن، ئێمەیش ناچار ئاهەنگمان بڕییەوە و لێی ڕاکشاین. هێشتا چاومان نە چووبووە خەو زرمەیەک لە شەمەندوفەرەوە هات شەمەندوفەر وەک لە شاخێ کەوتبێ گەڕایە دواوە، بە لادا هات، من سەرم لە تەختە کەوتن سەرم شکا، جارێ هەوڵی ڕەفیقەکەم بوو بانگم کرد:

– فرەدریخ فرەدریخ.

هیچ جواب نەبوو. کەوتمە مەراقەوە، چرایش کوژابووەوە، دیسان بانگم کرد، بە ئاستەم نووزەیێک هات، بە پەلەکوتێ چووم دۆزیمەوە، وتی:

– ئەلفرێد تەواوم، پارچەی واغۆنەکە کەوتووە بەسەر پێما، لاقم شکاوە.

ئاخۆ ئەم موسیبەتە چی بوو بەسەرمانا هات، هەر ئەمەمان مابوو. کوێقولاغ[194] بووم لە دەرەوە دەنگی خەڵک ئەهات لە شوێن بریندار ئەگەڕان، تومەز شمەندوفەر لە ئیستاسیۆنەکە لەگەڵ شەمەندوفەرێکی تر لێک کەوتبوون، وەرگەڕابوو، شکابوو.. هاوارم کرد هاتن دەستەبەرمیان پێ بوو، فرەدریخیان هەڵگرت. منیش لە تاوا برینی سەرم لە بیر چووەوە، شوێنی کەوتم، گەیشتینە خەستەخانە، لەوێ قاچی ئەویان گرتەوە و سەری منیان دەرمان کرد، وتیان:

– مەترسن هیچی واتان نییە.

ئەرابەیێکیان هێنا ئێمەیان سوار کرد بردینیانە قۆناغێکی[195] گەورە، بە ئارابانەوە بردیانە ژوورێ، ژن و پیاومان لێ کۆ بووەوە، ئیکرامێکی[196] زۆر چاو قاوە و شیر، پیاوێکی کەڵەگەتی نوورانی هات، هەواڵی[197] پرسین و

دڵخۆشیی داینەوە. زانیم ئەمە پیاوێکی گەورەیە، کە مەئموورەکەی خەستەخانە شەپقەی بۆ داگرت و کڕنووشی بۆ کێشا، منیش تەعزیمم[198] بۆ کرد، وتم: ئێمە بە فەلاکەتی[199] خۆمان موتەئەسسیف نین، بەم نیوە شەوە ئێوەمان لە خەو ڕاپەڕاند و نارەحەتمان کردن.

وتی:

– خێر، ئێمە بەوە مەمنوون ئەبین و بە دڵ ئیستیراحەت ئەکەین کە فریای فەلاکەت زەدەیێک بکەوین، ئەوەی پیاو بێ، ویجدانی بێ ئەزانێ کە خوا دەوڵەتی دایە، بۆ ئەوەی داوەتێ خیدمەتی لێ قەوماوانی هەژاری پێ بکا و خوێندەوار پێ بگەیێنێ، کە بە خوێندن خدمەتی مەملەکەتەکەیان بکەن، ئێستا چەند ڕۆژێ لێرە بحەسێنەوە، دوایی خوا کەریمە.

بە زۆر یەکدوو ڕۆژیان بەند کردین، سەر و پێمان چاک بوو، خیدمەتچیی ئۆدەکەمان کچێکی جوان بوو، بە فرەدریکم وت:

– کاکە ئەم کچە لە بەرتای دەستگیرانی تۆ دەکات.

کچەکە پرسی:

– بەرتا لە کوێیە؟

وتم:

– لە ناپولییە.

پرسی:

– زۆر جوانە؟

وتم:

– بەڵێ زۆر جوانە، ئەگەر لە ئەندازە بەدەر جوان نەبوایە، چۆنم ئەگوت لە تۆ دەکا.

کچەکە پێ کەنی،

وتی:

ئەی تۆ خۆت دەستگیرانت نییە؟

فرەدریک وتی:

- بەڵێ ئەو میقائیللا دەستگیرانیەتی کە بەرتا کارەکەری ئەوە.

وتی:

- کە وابێ ئەو بۆ کچی ئاغام، تۆ بۆ من.

وتم:

- ئاغاکەت کێیە؟

وتی:

- ئەوە بوو کە هات خۆشی و چلۆنی و بەخێرهاتنی کردن، یەکە پیاوی ئەم شارەیە، زۆر دەوڵەمەندە، ناوی موسیو (قوڵار)ە.

ئیـتـر نووسـتین، بەیانی بەرچایی و پەنیـر و چامـان خـواردەوە و دوعاخوازیمان کرد، هاتین بۆ دەرەوە لە داڵانەکە کە کچەکە هات بە دزییەوە کیسـەیێکی ئاوریشـمی سپیی دامێ. کـە هاتینە دەرێ ژماردم سـی لیرەی ئاڵتوونی تیا بوو، ئیتر لە خۆشیانا هاتین بەڕێوە، قەرارمان دا بۆ جارێکی تر سـواری شـەمەندوفەر نەبین، بە پێیان بـەڕێی شـەمەندوفەرا بڕۆین، ملی ڕێمـان گـرت، هەروا بـە ناوەڕاسـتی هەردوو لای ئاسنـەکـەدا ئەڕۆین، شـەو گەیشتینە سەر پردێک، لەسـەرەوە سەیری پردەکەمان ئەکرد، تێ فکریم لە پێشمـانەوە دوو چاوی تیژ وەک چاوی ئـەژدیها ڕووبەڕوومـان هات، پریشکی ئاگری لێ ئەبێتەوە، وتم:

- فرەدریخ، نامەرد فەوتاین ڕسگارمان نابێ.

وتی:

- با خۆمان فرێ دەینە ئاوەکەوە.

- وتم:

- مـەلە نازانم ئەخنکێم، با خـۆمان بە کـەناری پردەکـەدا هەڵاواسـتین تا

شەمەندوفەر ئەڕوا دوایی خۆمان ئەخەینەوە سەری.

من لە دیوێکەوە، فـــرەدریخ لە دیوێکەوە خــــۆمــــان بە کــــەناری پردا هەڵاواستی، من نەمزانیبوو سەرم لادەم، کە شەمەندوفەرەکە هات لرفەلرف ئاوی لە کـوڵی کـرد بە ســـەر و چاوما، دەمــوچاوم ســووتا، دەســتم برد دەموچاوم بسڕم، فلقها کەوتمە ئاوەکەوە.

*

ئێستا وا ئەلفرێد ئەفەندیمان لە ئاوا بەجێ هێشت، ڕەنگە ئەوانەی گوێ لەم سەرگوروشتەیە ئەگرن زۆر بەزەییان بە ئەلفرێدا بێت. کوڕێکی ئەوەندە ســافــدەروون و دڵپـاک و ڕەوشت چاک و بە وەفــا و ســەودا، لە عـیـشـقی جانانەدا[200] یار بێخەبەر، ئەو لە ڕێیدا بخنکێ زۆر ناخۆشە.

لەبەر ئەوە (پیـرەمـێـرد) خــەبەرتـان ئەداتێ ئەلفـرێد هەرچەند بەخنکاو ئەژمـێردرێ، بەڵام نەمـردووە، ئێســتـا وا لە قـۆخـڵی[201] لادێیـێکدا ڕایان کێشاوە، ئاویان لە زگ دەرهێناوە، ئەیشێلن خوێنی بجووڵێتەوە و بێتەوە هۆش خۆی.

جارێ با ئەو لەوێ بێ. فرەدریخ بۆمان بگێڕێتەوە چییان بەسەرهاتووە.

فرەدریخ ئەڵێ:

کە شـەمەندوفەر ڕووی تێ کردین لەسەر پرد بووین نەمانتوانی خۆمان لە ڕێ لادەین، چارمــان نەمـا ئەمــدیو ئەودیو خــۆمــان بە لێـواری پردەکــەدا هەڵاوەستی، شـەمـەندوفـەر بە تەوژم هات، ئاوی گـەرمی پرژاند بە ســەر و کوێلاکماندا. من سەرم لەبەر شالاوی ئاوە لە کوڵەکەدا، لادا، زۆری نەمابوو دەسـتم بەربێ، بە هەر ڕەنگێ بوو خۆم گیـر کرد، شـەمـەندوفـەر تێ پەڕی، هاتمەوە ســەر پرد، ڕوانیم ئەلفرێد دیار نییە، بانگم کرد جواب نەبوو، بەڵام کاتێ کـە ئاوە گـەرمـەکـەم بە ڕوودا هەڵپڕژا، شـەڵپـەیێکم لە گوێ هات، وەک دەنگی ئەلفـرێد وا بوو هاوار بکا. ئیـتـر گـوێم لە هیـچی تر نـەبوو، بە هـەموو

لایێکدا هاوار و بانگم کرد، له هیچ لایەکەوە دەنگ نەبوو، ئەگریام، ئامان ئەلفرێد لە کوێی؟ هیچ.

ئیتر بۆم مەعلووم بوو کە دەستی بەربووە و کەوتوومەتە ئاوەکەوە، لە تاوا خۆم فڕێ دایە ئاوەکەوە، نەمزانی ئاوەکە لەو ڕاستە ئەوەندە قووڵە و خوڕە، دەربەستی خنکان نەبووم، هەر بە شەرتێ ئەلفرێد نە خنکابێ و چاوی بە میقائیللا بکەوێتەوە، من سەد جار شوکور بووم کە لە باتی ئەو بخنکێم و زۆر مامەوە لە ئاوا، کە من ئەلفرێدم لەدەست چوو قیری سیا، با منیش بخنکێم، چی بکەم؟ کە ئەجەل نەهات بە زۆر نییە، شەپۆل فڕێی دابوومە کەناری ئاوەکە و بێ ڕووح کەوتبووم. بەیانی لادێیی هاتبوون بۆ ئیش منیان بە بێهۆشی دیبوو، دابوومیان بە کۆڵیانا، بردبوومیانە ماڵی خۆیان، ئاگریان بۆ کردمەوە، هێنابوومیانە هۆش خۆم، لە پاش ئەوە کە هاتبوومەوە هۆش دیسان گریابووم، ئەلفرێدم بانگ کردبوو، جوابی نەدابوومەوە، ئینجا شێت بووبووم، هەڵسابووم ڕام کردبوو وتبووم ئەچم شەمەندوفەر ئەکوژم، پرد ئەڕووخێنم، سەرەوژێری ئەکەم کە ڕەفیقەکەمی لەناو بردووە، بە زۆر گرتبوومیان، بەستبوومیان، تا سە ڕۆژ، ئینجا عەقڵم هاتبووەوە کەللەم، خواە ناخواە[٢٠٢] ماڵئاواییم لەو ماڵە بە ڕەحم و ئینسانییە خواست هاتمە لای پردەکە، گریام گریام بە مەقامی شیوەن گۆرانیم ئەگوت، هەرچی لەو ڕێییەوە ئەڕۆیی گلی ئەخواردەوە، هەندێ لە گەڵیشم ئەگریان، تا ئێوارە گریام، قەرارم دا ڕاوەستمە شەو، کە شەمەندوفەر هات خۆم بخەمە بەر شەمەندوفەرەکە، منیش لە پاش ئەلفرێد نامێنم. لە غەیبەوە یا لە خەیاڵەوە دەنگێکم هاتە گوێ، لە دەنگی ئەلفرێد ئەچوو، ئەیگوت:

– خۆت مەکوژە، بچۆ خەبەر بگەیێنە بە یار کە بە عیشقی تۆ مرد، شەهیدە.

بەم دەنگە هات بە عەقڵما کە بچم دەستگیرانەکەی بدۆزمەوە خەبەری بدەمێ کە ئەلفرێد لە ڕێی ئەوا چوو، هەر ڕاست بوومەوە، ئەو شوێنە

مەشئوومەم بە جێ هێشت تاهێزی پێم بوو ڕام کرد، تا لە چاوم کوم بوو، ئینجا لە خۆمەوە تووشی مەقامێک هاتبووم لە ڕاکردنا، لە وەستانا لە دانیشتنا هەر بانگم ئەکرد ئەلفرێد هێشتا ئەو شیعرانەم لە بیر ماوە کە بۆ ئەلفرێدم هەڵبەستبوو، بە شێتیتەوە ملی ڕێم گرت، ئەوەندە کە لەگەڵ ئەلفرێد بە یەکەوە سەرگوروشتەمان بەسەرهات، زیاتر لە ڕێ و بان دیم.

دوایی واپۆڕێک[203] بۆ ناپولی ئەچوو، بە دزییەوە و بە تەناف و قەلاتیا هەڵگەڕام لەناو پاپۆڕەکەدا خۆم شاردەوە تا گەیشتە ناپولی، لەوێ لە واپووڕ هاتمە دەرەوە، سەر ڕیختم[204] قەلەباڵغ بوو، تێکەڵ بە عەشاناتەکە بووم، نەمئەزانی چی بکەم، ئەرابەیێکم دی چوومە خۆمەوە دەرگاکەیم کردەوە، چووم دانیشتم، ئەرابەچی هات پەلی ڕاکێشام بمهێنێتە دەرێ، زلەیێکم لێ دا، چووین بە گژ یەکا، خەڵک هات وتیان:

– چیت ئەوێ؟

وتم:

– قەسری میقائیللا.

وتیان:

– لە کوێیە، ئادرەس چییە؟

وتم

– میقائیللا، دەستگیرانەکەی ئەلفرێد، نیشان بەو نیشان تەرپیریشیان لە کەڵە.

هەر ئەوەندەیان ئەگوت:

– نون قاپیشۆ

دایان بەزاندم هەرچی تووشی ئەهاتم، ئەمپرسی میقائیللا:

– نون قاپیشۆ.

سەد نون قاپیشۆیان پێ وتم، سە شەو سە ڕۆژ، بەم نون قاپیشۆیەم

ڕابوارد، تا ڕۆژێکیان لە دووکانی فوتۆغرافچییێک ڕەسمی ئەلفرێدم لەو دیو شووشەی دووکانەوە هەڵاوەسرابوو، پەلامارم دایێ، شووشەم شکاند، ڕەسمەکەم گرتەوە باوەش، بێهۆش کەوتم، کە هاتمەوە هۆش لە ئەجزاخانەیێک دەستیان دەرمان کردبووم کە شووشەکەم شکاندبوو دەستم بریندار بووبوو، بێهۆش بووم ڕەسمەکەم لە باوەشدا بوو، بە بێهۆشیش بەرم نەدابوو. لێیان پرسیم:

– ئەمە کێیە؟

وتم:

– برامە و لە ئاوا خنکاوە،

وتیان:

– کورە ئەمە زیندووە، سە ڕۆژە ئەم ڕەسمەی گرتووە، بەڵکو یەکێکی تربێ لە براکەی تۆ بکا.

وتم:

– خێر هەر ئەوە خنکاوە.

– پیاوێک وتی:

– ڕاوەستە بتنێرمە ماڵی ئەو پیاوە ماقووڵە.

ئەرابەچیی بانگ کرد، سوار بووم، لە خۆشیانا لەناو ئەرابەدا نەوەستان، خۆم کوتایە لای ئەرابەچییەکە، وڵاخەکان گورج لێ خورم، دانەویمەوە زلە لە وڵاخ بدەم، شلپ کەوتمە خوارێ، دەست بریندار سەر شکاو، ئەرابەچی دابەزی بە هەزار حاڵ سواری کردمەوە، گەیشتینە بەردەرگایێکی گەورە، بە ئیشارەت وتی: ئەوەتە، خۆم فڕێ دایە خوارێ، ڕام کرد بچمە ژوورێ، ئەرابەچی لە پشتەوە چاکی ڕاکێشام، من ئەوم ڕاکێشا، تومەز داوای پارە ئەکا، من لە خۆشیانا نەمپەڕژابوو پارەی بدەمێ، لە مشت و مڕی ئێمە قەڵەباڵغ کۆبوونەوە، خەڵکی ئەو قۆناغەمان بە سەرا ڕژا، پیاوێکی گەورە

هاته دەرێ، لە ئەرابەچی تووڕە بوو، بە ئیتالیایی پرسی:

- چیت ئەوێ؟

وتی:

- پارەی نەداوە.

لیرەیێکی بۆ فڕێ دا وتی:

- بڕۆ.

کە ڕوانیم ئەمە ئەلفرێدە، بەو دەستە بریندارەوە و بە و خوێنی سەرەوە پەلامارم دایە، خۆم بە ملیا هەلاوەستی، تێر ماچم کرد، بردمیانە ژووری[٢٠٥] دوکتۆری خۆیان، هێنا سەری شوشتم، دەرمانی لێ نا، ئێستا وا لەگەڵ ئەلفرێد لە سالۆنی قۆناغەکە دانیشتووین.

***

هانام بەو وەخت و سەعاتە، کە ئەم دوو برادەرە وەفادارانە بە یەک گەیشتنەوە، هاوڕێکانی میللەت و نیشتیمانەکەیشمان دەربارەی یەک وابن و لە ڕێی خیدمەتی نیشتیماندا وا بە وەفا و ئیقدام[٢٠٦] و خیدمەت و خۆشەویستی یەک بن ئینجا هانام بەو دەمەی کە ئەلفرێد بە وەسڵی میقائیللا شاد بوو.[٢٠٧]

"لێرە بەولاوە لە چاپەکەی کاکەی فەلاح-ەوە وەرگیراوە"

منیش ئەو کچە جوانەی کە لە دیباچەی ئەمجڵدی دواییەدا نووسیومە نەمناسیوە، ئەم بەهارە تووشم بێتەوە بە عەشقی ئەو ڕوومەتە جوانە کە بریقەی دابووە سەر جڵدی یەکەمی ئەم کتێبە، منی شەیدا کرد ئەمەم بۆ تەواو کرد بەڵکو ئارەزووی ئەسەرێکی وەک ئەو جوان بێنمە مەیدان.

بەلام درێغ و ئەفسووسی نە ئەو ناسراوە و نە من ئەو گوڕەم ماوە، ڕەنگە خوێندەوارەکان بپرسن ئەلفرێد چۆن گەیوەتە ئەوێ؟ چۆن خانمەکەی دەست کەوتبوو، یەکەمجار فرەدریک لێی پرسی: ئەلفرێد چۆن ئەم مەحبووبەی[٢٠٨]

جیهانه و ئەم پرەنسی ئیتاڵیایە بە تۆ برا و بە تۆ درا؟ وەڵامی دایەوە، فرەدریک سەرگوزەشتەی ئێمە سێ شتی تیایە، لە سێ شت چاکترە.

یەکەم: دەروون و نیەتی پاک و چاک لە ئاین و ئۆینی سیاسەت و دیبلۆماسی و هەوڵی باشترە.

دووەم: وەفاکاری لە جوانی باشترە.

سێیەم: ئەخلاق لە پارە پەسەندترە.

من دەروونێکی پاکم بوو، لادێییەکی بێ فروفێڵ بووم، کە تووشی میقائیللا هاتم سەفەرەکەم کاری تێ کرد، تا ئەهات لەلای پەسەند ئەبووم.

دووەم، لە وەفادا لە وێردە کۆنەکەی بۆی بە وەفاتر و فیداکارتر بووم و وەفای من پێش زۆر داواکاریی تر کەوت.

سێیەم، ئەخلاقی من و عەشقی ڕاستی، قەناعەتی بەو پەیدا کرد کە لە هاوسەریدا عەشق و ئەخلاق لەسەرسەرێتی و گەورەیی ساختە و قوماری و سەرخۆشی بۆ ئافرەت چاکترە، من بە خنکان و حەپس و تێ هەڵدان عەشقی ئەوم فەرامۆش نەکرد، دەستم لە وەفا بەر نەدا، تا دەستم لە ملی یاد ئالا. تۆش کە یاری وەفاداری من بووی، هێندەی من و بەڵکو لە من زیاتر بە کێش بووی وا گەیشتینە مەرام، وا بە من و میقائیللا (بەرتا)مان پێشکەش کردی.

کەوایەکی سورمەیە "بەرتا"
ئەم جلانەت داکەنە و ئەو بکە بە بەرتا.

تەواو بوو

## فەرهەنگۆک

(١) چیـقـدی، چیـقـدی، چاڵغـیـجی: "تورکـیـیـە" واتە: دەرچوو دەرچوو ژەنیـار "کەمانچەژەن".

(٢) عەلی دایی: خاڵۆ عەلی.

(٣) پۆڵ دەقووق: زانیاریم لەبارەیەوە دەست نەکەوت.

(٤) حوسێن ڕەحمی:

(٥) ئاسار: شوێنەوار، مەبەست بەرهەمی کتێب و نووسینی دانراوە.

(٦) لەپەردە بەدەر، قسەی لە ڕەوشت بەدەر.

(٧) تۆفیق بەگی کەرکووکی "میرالای": زانیاریمان لەبارەیەوە دەست نەکەوت.

(٨) تەرح: لە وانەی ژماردندا، لێ دەرکردن، لێ کەمکردن.

(٩) پرنس: میر.

(١٠) شەوکەت: هێز. دەسەڵات.

(١١) لاندوو: جـۆرە عـەرەبانـەیەکـە لە دوو لاوە دەرگـەی بۆ سـواربـوونی هـەیە، سەیوانێکی چەرمینی هەیە هەڵدەکرێت و دادەدرێتەوە.

(١٢) موتڵەقا: هەبێ و نەبێ. بەهەر شێوەیەک.

(١٣) گەوڕ: تەویلە.

(١٤) لەم دەستەواژەیە نەگەیشتم.

(١٥) سـە: سێ (ژمـارە ٣) سـە، شـێوە فـارسـییـەکـەیەتی، پیـرەمـێرد خـۆی بەو شـێـوەیەی نووسـیـوە، ئەمـەیانم بۆ نموونە هـێشـتـەوە، لە شـوێنەکـانی دیکەدا کردمن بە سێ.

(١٦) وەچە توتون: لقە کچکەی تووتن کە لە لقی دیکە دەبێتەوە.

- توتون: تووتن.

(١٧) خوست: دەنگ، جووڵە.

(١٨) هەنگڵ هەنگڵ ئاوسان: لە پەستی و توورەییيان بنهەنگڵ بەرزبوونەوە.

(١٩) شەتارەت: شەن و شۆخی.

(٢٠) لەقەب: نازناو، ناوی بنەماڵە و عەشیرەت و هی دیکە.

(٢١) ناخواە: زۆرەکی، بەبێ ویستی خۆی..

(٢٢) هەڵکاڵان: بە ئێرەیی باس یان تەماشا کردن.

(٢٣) ئیکرام: ڕێزگرتن، بە گەورە دانان.

(٢٤) نەزاکەت: ناسکی، بایەخ..

(٢٥) چورووک: چرووک، تێکچوو، شتێک کە چاک یان بتەو نەبێ.

(٢٦) پیندار: خەیاڵ، سەرسوڕمان.

(٢٧) عیفەت و نەزاکەت مەئاب: ئەی پەناگەی بە ئابڕوو و ناسک.

(٢٨) ئەلقاب: کۆی "لەقەب"ە، واتە: نازناو.

(٢٩) فەساحەت: زمانپاراوی.

(٣٠) خودگیری: خۆ ڕاگرتن.

(٣١) فت کردن: دوای جگەرەکێشـان کە تەنیا قـونچکەجگەرەکـە بە دارجگەرە و دەمێنێ، فوویەک بە دارجگەرەوە دەکرێ قونچکە جگەرەکەی لێ دەردەپەڕێ، یانیش سبیل لە پاشـماوەی تووتن و خۆڵەمێش بەتاڵ کردن و دەنگێکی وەک "فت" دەردەکا، دەڵێن: جگەرەکەی فت کرد.. دواتر "فت کردن" بۆ واتای دیکەش بەکار هاتووە.

(٣٢) کنگەخەو: بە دانیشتنەوە نووستن.

(٣٣) ڕەوڕەوە: تایە، چەرخ.

(٣٤) فەنار: یان فەنەر: چرا و ڕووناکی، لێرەدا چرای عەرەبانە.

(٣٥) تەریدە: جەردە و ڕێگر.

(٣٦) لۆقە: ڕۆیشتنێکی دەوانی نێوان بە گوڕ ڕۆیشتن و غاردان.

(٣٧) قەید ناکا: قەیناکا.

(٣٨) شـاتۆ: (ناوێکی لاتینی و فرەنسـییـە)، شـوێنی دانیشـتنی دەرەبەگەکـانی ئەورووپای سـەدەکانی ناوەڕاست کـە خـانووی زۆر گـەورەی شـوورەدار و دیوار بەرزی قولەدار و بە کەندەک دەورەدراو بووە.

(٣٩) ئۆرمان: دارستان.

(٤٠) جەنگەڵستان: دارستان، لێڕەوار.

(٤١) مێرغوزار: مێرگوزار.

(٤٢) قەمقەمە: قاقای پێکەنین.

(٤٣) حوزن: خەم، پەژارە.

(٤٤) لوتف: چاکە، یارمەتی.

(٤٥) واوەیلا: خەم، هەناسە ساردی، مخابن..

(٤٦) بێشە: جێگەی پڕ لە دار و دەوەن، لێڕی دەستنێژ.

(٤٧) نیمنیگاه: نیونیگا، بە لاچاوێکەوە ڕوانین.

(٤٨) چوختی: چەقاوەسوو، لە کاردا پوختە بوو.

(٤٩) زابیتە: پۆلیسی ناوخۆی نیمچە فەرمی.

(٥٠) بەیدەست: دەستگیر.

(٥١) بەچەشێر: بێچووە شێر، بەچکە شێر.

(٥٢) وەلوەلە: گریان و هات و هاوار.

(٥٣) پەتیارە: پەتەڕی، شێتۆکە.

(٥٤) زەهرەترەک: زارەترەک، زۆر ترساو، تۆقیو.

(٥٥) دێکانی: خەڵکی لادێ، گوندی.

(٥٦) ئەسلاَ: ئەسڵەن "بە زۆری تورک بە کاری دەهێنن"، هەرگیز.

(٥٧) بەر لە وشەی دیسان وشەی (توست) دانرابوو بە زیادەم زانی و لامبرد.

(٥٨) لە دەقەکەدا نووسراوە (محافظت) دیارە هەڵەی چاپە، کردمانە (حافیزە) واتە هێزی لەبەر کردن.

(٥٩) ڕاهیب: قەشە.

(٦٠) ئیستیحکام: توند و پارێزراو.

(٦١) ئۆتە: ئۆدە، ژوور.

(٦٢) تەلاش: پەلە پەل.

(٦٣) ڕیتاڵ: جلی شڕ و شیتاڵ.

(٦٤) لە ئەسڵەکەدا بەمجۆرەیە، لە بوونی ئەم (- زوج الکبیر -) ەی ئێرە تێ نەگەیشتم.

(٦٥) یازیخانە: نووسگە.

(٦٦) سەیفندە بە ڕۆژی: لەم زاراوەیە تێ نەگەیشتم.

(٦٧) هیلکانەوە: بە حیلکە پێکەنین.
(٦٨) داماد: زاوا.
(٦٩) فەتەرات: فەتارەت. بەڵا.
(٧٠) ئاشچی: شیوپەز، شیولێنەر.
(٧١) هەرزە چەنە: چەنەباز، هەرزەبێژ، هەرزەگۆ. چەنەبازیی بێ سوود.
(٧٢) شادمەرگ: شامەرگ. لە خۆشییان مردن.
(٧٣) زەریف: دڵگر، دڵپەسند.
(٧٤) مەرام: مەبەست.
(٧٥) پەڵوولە: خواردەمەنییەکی شلە، لە ئارد و رۆن دروست دەکرێ.
(٧٦) وۆحـە: وشـەیەکـە بە تایبـەتی بۆ دەرکـردن و دوورخسـتنەوەی مـانگا بەکـار دەبرێ.
(٧٧) ئنتەر: رێ پێدان (زاراوەیەکی ئینگلیزییە)،
(٧٨) نوقیزە: داردەستێکە بزمارێکی بە سەرەوە دەکرێ بۆ تێوە ژەندنی وڵاخ.
(٧٩) هورتەوپەرە: داب و نەریت.
(٨٠) ئاقۆرد: دەوزەن، رێکخستنی ئامێری ژێداری مۆسیقایی.
(٨١) لۆقە: نیوەغار.
(٨٢) کورکە: نیوەغار.
(٨٣) کۆڵی سوار: ئەوەی سواری چاک نەبێ.
(٨٤) غراوات: بۆینباغ.
(٨٥) داکردن: کردنە ژوورەوە، بە زۆری بۆ ئاژەڵ بەکار دەهێنرێ.
(٨٦) گوستاخ: بێعار، بەدڕەوشت.
(٨٧) قوتوولە: قوتیلە، چرای فتیلە.
(٨٨) رتوویەت: شێ.
(٨٩) لە دەقەکەدا (دایو)، کە وشەیەکی تورکیی واتە: خـاڵۆ. ئێمە کوردییەکەیمان دانا.
(٩٠) کولک : زۆر بەژان.
(٩١) بەکچی: پاسەوان.
(٩٢) مانتان: جۆرە کراسێکی نەخشدارە.

(٩٣) گەوڕ: تەویلە.

(٩٤) بەڵمەبرنج: کا و کەپەکی برنج.

(٩٥) مـاروکـەنی لـوکس: لوکس واتە چاک، نـایاب. بەڵام (مـاروکـەنی)م بۆ سـاغ نەبووەوە.

(٩٦) سوورفل: مرۆڤی سوور و سپیی موو زەرد.

(٩٧) لیس: تـیـڵا و داری درێژ. لەوە دەچێ پیـرەمـێـرد ئـەمـەی لە خـۆیـەوە بۆ زیاد کـردووە و گـەمـەیـەکی زمـانەوانیی بۆ خـۆشی لە نزیکیی دوو وشـەی لیس و لیستە دروست کردووە.

(٩٨) ئەو ڕستـەیە هەر بەو جۆرە بوو، بەش بەحاڵی خۆم بە ڕاستی نازانم، دەبوا بڵێ: ڕاوەستە پێت نیشان بدەم، یان، ڕاوەستە نیشانتی بدەم. لەگەڵ ئەوەشدا هەر وەک خۆیم بەجێ هێشت.

(٩٩) کەفچە: کەفگیر.

(١٠٠) هەڵچوڕاندن: خواردنەوە، یان ڕشتنی هەمووی تا دوا چوڕ.

(١٠١) تەغاراو: ئاوی بەردەستی پینەدوور لە کاتی کارکردندا.

(١٠٢) سووتەمەروو: داری تێکەڵ بە ئاگر هەڵپرووزاو.

(١٠٣) بۆم ساغ نەبووەوە مەبەست لە "ورچەکەی مندۆڵ" چییە؟

(١٠٤) بێڵەکانی: دارێکی دادراوە، یان دارێکە ئاسنێکی دەم پانی تیژی پێوەیە گژ و گیای پێ هەڵدەکەنرێ.

(١٠٥) قەڵتاغی زین: پارچە چەرمێکی خۆشکراوە، دەکرێتە ژێر زینی وڵاخەوە.

(١٠٦) پۆپەشـمین: پێـخـەفێکی شـاشی هاوینییـە، لە خـوریی ڕێسـراوی باریک دروست دەکرێ.

(١٠٧) چەودار: گیایەکی وەک گەنم وایە لەناو گەنمدا دەڕوێ.

(١٠٨) پاپاس: قەشە.

(١٠٩) بەلان: پیاوی تەژەی زەبەلاح.

(١١٠) سەنگەسار: بەردباران.

(١١١) لە دەقەکەدا نووسراوە (مویبخ)، دیارە هەڵەی چاپە.

(١١٢) خواجەنشینی: خواجانە، دوو سەکۆی دوو لای دەروازە بۆ دانیشتن.

(١١٣) تەپلە: کڵاوی لباد. جۆرێ کڵاوی ژنانە.

(١١٤) قۆناغ: ماڵی گەورە.

(١١٥) ڕەوغەنی جەلا: ڕوونی بریقە پێدان.

(١١٦) سەرەناز: ڕایەخی لاکێشەی باریک.

(١١٧) نوتق: وتاری خوێنراوە، یان سەرزارەکی.

(١١٨) چەتەوڵ: پاسەوانی شەو.

(١١٩) ئەیواه: مخابن.

(١٢٠) سوخت بوون: پەست بوون، تووڕە بوون.

(١٢١) پاردۆن: ببوورە. وشەیەکی فەرەنسییە.

(١٢٢) دەقۆڵتە: نەمزانی چ جۆرە جلێکە.

(١٢٣) لەگەن: قاپی مسی گەورە کە ملی هەڵگەڕابێتەوە. دەفری مسی دەم واڵە.

(١٢٤) قاعەدە: قەعادە، قەعدە، شتێکی وەک کورسییەکی بچووکی مندالانەیە، بۆ دانیشتن و پیسایی تێداکردنی منداڵی بچووک.

(١٢٥) ئاوستریا: نەمسا.

(١٢٦) یۆقلەمە: پشکنین "وشەیەکی تورکییە".

(١٢٧) لەو دانەیەی لەبەر دەستماندا بوو، لێرەوە تا سەرەتای (جلدی دووەم)ی نەمابوو، لە لاپەڕە (٩٢ - ٩٣)ی چاپی "کاکەی فەلاح"مان وەرگرت.

(١٢٨) بالو: ئەو یانە و کۆمەڵەیەی سەمایان تێدا دەکرێ. لە چاپەکەی کاکەی فەلاحدا کراوە بە بالێ.

(١٢٩) لە پەراوێزی ئێرەدا "پیرەمێرد" ئەم تێبینییەی نووسیوە: "ئارەزوومان وابوو هەموو کتێبەکە بە جارێک لە بەرگێکدا چاپ بکەین، بەلام زۆر ئەستوور و ناشیرین دەبوو، کردمان بە دوو بەرگ، وا لێرەدا بەرگی یەکەممان جوێ کردەوە، دوای ئەمە بەرگی دووەم دەست پێ دەکرێ - پیرەمێرد."

(١٣٠) یۆنای ناکەم: پێم تەسەوور ناکرێ. کاکەی فەلاح کردوویەتییە: وێنەی باکەم.

(١٣١) سوخت بوون: تووڕە بوون، پەست بوون. لە دەقەکەدا "سەخت".

(١٣٢) فیراقە "فیراقەتە": تەوقەی پرچ و شتی دیکە.

(١٣٣) غارسۆن: گارسۆن، "وشەیەکی فەرەنسییە" واتە: شاگرد. لە باشووری کوردستاندا "بۆی" کە ئینگلیزییەکەیەتی باوە.

(١٣٤) ماسە: مێز، تێڵەک. لە دەقە چاپکراوەکەدا نووسرابوو "ماحەیەک".
(١٣٥) سەلاسە: سەلاسە: شلەیەکی وەک سووپ.
(١٣٦) دەستی: دەفرێکی گۆزەیە بۆ ئاو و شلەمەنی تێکردن. لەوانەیە ڕاستەکەی "تەپسی" بێ کە بە تورکی بە سینیی گچکە دەگوترێ..
(١٣٧) پەچەتە: دەستەسڕێکە، بەتایبەتی لە کاتی نان خواردندا بە کار دەبرێ.
(١٣٨) بەزمییتان: وشەکە لەناو دەقدا لێرە و لەجێی دیکەشدا نووسراوە "بە زەویتان"، دیارە دەبێ هەڵە بێ.
(١٣٩) قەفاوین: قاوەخانە.
(١٤٠) دەرگانە: مەبەست (لێرە) دەرگەی گەورە. وشەکە لە بنەڕەتدا: پارەیەکە لەبەردەگا بۆ چوونە ژوورەوە وەردەگیرێ.
(١٤١) پاپاغان : تووتی.
(١٤٢) سفارش: سپاردن.
(١٤٣) وشەی "نەک"ی ناو کەوانەکە من بۆم زیادکردووە بۆ ڕێکخستنی واتاکەی.
(١٤٤) غازینۆ: گازینۆ.
(١٤٥) ماسە: مێز.
(١٤٦) عموومخانە: کۆمەڵگەی ئەو سۆزانییانەی بە فەرمی لە ژێر چاودێریی حکوومەتدا کار دەکەن.
(١٤٧) قیافەت: شێوەی جلوبەرگ.
(١٤٨) دوبل: دەبڵ، دوو ئەوەندە.
(١٤٩) من پیاوێکی فەقیرم: لە دەقەکەدا: من پیاگێکی فەقیرم.
(١٥٠) عەشەرات: دەیان.
(١٥١) میئات: سەتان.
(١٥٢) سوخت بووم: تووڕە بووم. پەست بووم. لەدەقەکەدا: سەخت بووم.
(١٥٣) فوتوور: لە کار ساردبوونەوە. تەمبەڵانە.
(١٥٤) دۆلاندیریجی: ساختەچی. کەسی بە فروفێڵ.
(١٥٥) کارنەواڵ: کەرنەڤاڵ، ئاهەنگی بە دەمامک.
(١٥٦) لاتەڕنە: ئەم وشەیەم بۆ ساغ نەبووەوە.
(١٥٧) ئاقتارمە: پشکنین.

(١٥٨) بادی هەوا: هەر بە خۆڕایی.
(١٥٩) ئیکرام: ڕێز لێگرتن و بەخشندەیی لەگەڵدا کردن.
(١٦٠) تەنزیل: داگرتنی بەها.
(١٦١) فیئات: بەها (بایی).
(١٦٢) باری: بەتورکی واتە: هەر هیچ نەبێ.
(١٦٣) لە دەقەکەدا (ڕەشکە)یە.
(١٦٤) لە دەقەکەدا (ایسیا)یە.
(١٦٥) سێبەندە: نێوان جوچکەی سمت و کەمبەر.
(١٦٦) پەنچک: پارچە. لەتە نان.
(١٦٧) لە سێ هەنگاوا: لە سێ هەنگاودا.
(١٦٨) بڕایەوە: کۆتایی هات.
(١٦٩) سەمت: وشەیەکە تورک بە واتەی: گەڕەک، ناوچە. بەکاری دەهێنن.
(١٧٠) گلێنە: سواڵەتی لە گڵ دروستکراو
(١٧١) یایە: خانم، وشەیەکی کۆنی کوردییە بەرامبەر (السید)ەی عەرەبی بەکار دێ.
(١٧٢) مانتۆ: کەلپەلی بەرین و بێ قۆڵە.
(١٧٣) خوڵق: بانگکردن.
(١٧٤) کۆمپارتمان: بەش.
(١٧٥) زیل: زەنگ.
(١٧٦) چاڵم: (لێرە) کەش و فش.
(١٧٧) دەرکەنار: دوورەدەست.
(١٧٨) شەف ترمن: نۆبەتچیی شەمەندوفێر.
(١٧٩) خوست: دەنگ، نقە، ورتە.
(١٨٠) بیرمان: لە دەقەکەدا (بترمان).
(١٨١) باوجوود: لەگەڵ ئەوەشدا.
(١٨٢) نانی حۆققەیی: نانی سەنگینی چاک.
(١٨٣) بە بتوونی: بە تەواوی. لێ نەشکاو.
(١٨٤) نیهایەت: لە کۆتاییدا.

(١٨٥) له پارەی دارایی خۆم: له دەقەکەدا: "له پارەی دارا خومەم".
(١٨٦) ئیستاسیۆن: وێستگە.
(١٨٧) چەوتە و شیلە: چەوتە و چیلە: وردبوونەوە له جوانی و ناشیرینیی شتێک.
(١٨٨) پێ نیشانتان ئەدەم: دەبوایە: "پێتان نیشان ئەدەم" بووایە.
(١٨٩) لەپێش "ئەوا ناوێکم بیست"ەوە وشەی "نوست" هەبوو بە زیادەم زانی و لام برد.
(١٩٠) کەمانجەکەم ئاقۆردم کرد: کەمانجەکەم دەوزەن کرد. ژێیەکانم ڕێک خست و ئامادەم کرد
(١٩١) ڕەزالەت: خراپە. شەرمەزارە.
(١٩٢) ئەم بێشەرم و : له دەقەکەدا: ئەب بیشرب و..
(١٩٣) لەولاوە: لەناو دەقەکەدا (له داو لاوە) چاپ کراوە، دیارە هەڵەی چاپە.
(١٩٤) کوێقولاغ بووم: هەستم دایێ.
(١٩٥) قۆناغ: ماڵێکی گەورە.
(١٩٦) ئیکرام: ڕێز لێگرتن. میهرەبانی لەگەڵدا کردن.
(١٩٧) هەواڵی: له دەقەکەدا: همە والی.
(١٩٨) تەعزیم: ڕێزلێگرتن. بە گەورە دانان.
(١٩٩) فەلاکەت زەدە: کارەسات لێداو.
(٢٠٠) جانانە: خۆشەویستی گیانی بە گیانی..
(٢٠١) قۆخڵ: خانووی بچکۆلانە.
(٢٠٢) خواه و ناخواه: بە ئارەزوو و بەبێ ئارەزوو.
(٢٠٣) واپۆر: کەشتی.
(٢٠٤) ریختم: شۆستەی کەنار دەریا.
(٢٠٥) ژووری: له دەقەکەدا "ڕۆژی".
(٢٠٦) ئیقدام: ئازایەتی و چوونە پێش.
(٢٠٧) لەو دانەی کتێبەکەی لەبەر دەستماندا بوو، تا ئێرەی تێدا بوو، لێرەوە له چاپەکەی کاکەی فەلاحمان گواستووەتەوە.
(٢٠٨) مەحبووبە: خۆشەویست.

تێبینی:

- لە جلدی یەکەمدا، ناوەکەی لە هەموو شوێنێکدا بە (فرەدریخ) و لە جلدی دووەمدا بە (فرەدریک)، یەکەمیان شێوەی ئەڵمانیی ناوەکەیە.
- نازناوی میکائیللا لە هەموو شوێنەکاندا وەک یەک نین: لە هەندێک شوێندا (قورتساس) و لە هەندێک شوێنی دیکەدا (قورستا)یە. نەمانزانی کامیان ڕاستە.
- ژمارەبەندیی بەشەکانمان وەک کتێبەکە (چاپی پیرەمێرد) هێشتەوە.

## پێرست

هێشتا لە ئەستەموول بووم ڕۆژێ ئەو منداڵانەی ڕۆژنامە ئەفرۆشن بە هەموو کۆڵاناندا ڕایان ئەکرد و ئەیانقیژاند: "چیقدی چیقدی چالغیچی"، فۆرمەیەک کە هەشت لاپەڕەیە لە ڕۆمانی سەرگوزەشتەی چاڵغیچی، کە ئێمە تارژەنی پێ ئەڵێین دەرچووە ئەیفرۆشن. یەکێکم کڕی، شەو خوێندمەوە زۆر خۆش بوو، ئینجا دانیشتین بە کۆمەڵ خوێندمانەوە ئەمەندە خۆش بوو لە دڵمانا بوو بە گرێ، ئاخۆ سبەینێ فۆرمەی تری دەردەچێ؟ بەیانی فۆرمەیەکی تری دەرچوو کڕیمان، شەو هەموو کۆ ئەبووینەوە یەکێک ئەیخوێندەوە ئەمەندە پێی پێ کەنین مەپرسە. ئەمە هونەرمەندێکی ئەڵمان نووسیویە، تۆفیق بەگی میرالآ، کە مەشهوورە بە "تۆفیق بەگی کەرکووکی" و ئەویش کوردە، وەری گێڕاوەتە سەر تورکی، بەڵام تورکییەکەی ئەم، لە شێوەی ئەڵمانییەکەی شیرینترە. چەندێکە ئەمویست منیش بیکەم بە کوردی، زاتەن ئەو تۆفیقەی کە کردوویە بە تورکی دیسان کوردە، تا ئەمساڵ بۆم نەدەکرا، هەتا چەندێک مستەفای خوشکەزام خەریکی بوو، بە خەریتەزانی، هەندێکیشی تەرجەمە کردووە، بەڵام ئەشکالی ئەشغال مەیدانی نەدا، ناچار وا خۆم دەستم پێ کرد، ئێمە دوو تۆفیق.. تۆفیقیش لە خوا.

پیرەمێرد

**Violinist**

*Translation from German to Turkish:*
**Tofiq Kirkuki Miralaye**
*Translation from Turkish:*
**Tofiqi Piramerd**
*Book Preparation:*
**Ahmed Taqana**






رێنووسی یەکگرتوو


ISBN 978-9933-487-33-1
9 789933 487331
بایی ۲۵۰۰ دینارە